ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی
ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی

# سروه

ئەدەبی و فەرهەنگی

١٨



| دی ١ | بەفرانبار ١ ١٣٦٦ | R 22 |
| --- | --- | --- |

سێ شەممە

١٨

گۆواری فەرهەنگی ـ ئەدەبی سروە ـ ساڵی سێهەم ـ ژمارە ١٨ ـ بەفرانبار ١٣٦٦ ـ نرخ ١٥ تمەن

# موناجات

## حەمدی

ئەم سەرا پەردەیە کە بەرپا بوون
مانگ و رۆژی هەڵات و ئاوا بوون
ئەم نجوومە کە سابیتە و سەییار
ئەم شەها بانەیان کە ئەفشا بوون
ئەهلی بالا کە پێی ئەڵێن مەلەکووت
لە بەڵای لابەلا کەوەک ئما بوون
ئەم خەلایە کە پڕ لە ئەسواتە
ئەم هەوایانە گێژ و سەودا بوون
ئەم زەمینە بە شاخەوە کوردی
گەوهەرێ بوو کە غەرقی دەریا بوون
ئەم وجوودە یەکی کە نەوعێکە
لە ئەزەل یەک نەسەق کە ئەشیا بوون
قیسمێ حەیوانی ناتیق و ناهیق
وەک گژوگیا کە جوملە ئەحیا بوون
کوفر زاهیر نەبوو لە باتین دا
کەیەهوودو مەجووس وتەرسا بوون
هەموو یەک قەول ویەک زوبان یەکدڵ
بێ تەفاوت بە حەلقە وەستا بوون
ئەمە بوو زکریان بەیەک شێوە
هەرچی زیر وحی پەست وبالا بوون
لە ئەزەل تا ئەبەد خوا، خوایە
جیلوەیەکە کە پڕ دوو دونیایە
یا ئیلاهی بە قەدری تۆ بێ شک
( ما عرفناک حق معرفتک )

خوێنەرانی بەرێز سلاو

بەر لە هەموو شت سپاسی ئەوان خوێنەرانی بەرێز دەکەین بە ناردنی نامە دڵبەندی خۆیان پێشان داوە و بەرەخنەوپێشنیاری بەجێ ڕێنوێنی یان کردووین. بەراستی ئەمڕۆژانە گەلێک دۆست وبرادەر نامەیان بۆ نووسیوین ولە نامەکانیاندا را وپرسیار و بۆچوونێکی زۆریان هێناوەتە گۆڕ،بۆیە وامان بەباش زانی کەلەم دەرفەتەدا شازی وگرینگی پرسیارەکان باس بکەین و پێکەوە قسەیان لەسەر، بکەین .

یەک لەو پرسیارانە کە بە نامە وتەلەفۆن و قسە لەسەری دواون **هۆی وەدرەنگی کەوتنی چاپ وبڵاوبوونەوەی سروە بووە.** خۆشەویستان لەوبارەوە زۆر پەرۆش و دڵگیر بوون و گلەیی یان کردووە. هێندێکیش لە **کەم بوونەوەی لاپەڕەکانی سروە** دواون و چەند کەسیش **کاغەزەکەیان بەدڵ نەبووە.** لافاوی رەخنە و پرسیار

# نێوەرۆک

## تێبینی لەسەر سروە

هەروەک خوێنەرانی بەڕێز دەزانن ئەم ناوەندە ماوەی دوو ساڵ گۆواری بە سێ مانگ جارێک دەرکردو بەرەبەری ساڵی سێهەم بە پێی ویست وداوای زۆری خوێنەران بڕیاری دا تا سەبارەت بە مانگانە کردنی سروە تەما بگرێ.بەداخەوە بەرێوەبردنی ئەم بریارە هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی زۆر گیروگرفتی وەک کەم بوونی کاغەز وزینک و.... بوو. بۆیە سەرەڕای ئەو حەول ودەولەی بۆ سازکردن وئامادەکردنی سروەی مانگانە درا و گۆواری مانگانەش ساز بوو، کۆسپی گۆڕین بۆ چاپ بوو بەهۆی ئەوە کە دەرچوونی گۆوارەدرەنگی بکەوێ وسروەی خاکەلێوە ئاخری بەهاری ۶۶ گەیشتە دەست ئێوە وچاپی ژمارەکانی دیکەش هەروەتر.

لەم ماوەدا زۆر حەول درا وئەم مەبەستە لەگەڵ هێندێک لەبەرپرسان باس کرا ولە ئاکامدا پاش وەلابردنی ئەم کۆسپانە و ئامادەکردنی کاغەز وزینک و...کاری لەچاپدانی سروە هاتەوە سەرباری جاران و بوو بەهۆی ئەوە گۆوارە دواکەوتووەکان یەک لە دووی یەک چاپ کرێن.ئێستا بۆخۆتان شاهیدن پاش ئەم وەستانە دوور ودرێژە ئ چەند ژمارەی دوایی بەڵ لەچاپ درا تا بەڵکوو ب شێوە بتوانین شێوازی کا ئاسایی بکەین وژمارەکانی داهاتوو بەوەخت وەدەست خوێنەرانی بەرێز بخەین هیواداریین ئەم لەزوبەزی لە داهاتووشدا بپارێزین..

ئەمجار بێینە سەرباس کاغەز. بەداخەوە ئێستا جگە لەم چەشنە کاغەزە کاهی یە کاغەزێکی دیکە بەدەستەوە نیە ووەنەبێ ئەوە تەنیا گرفتی ئێمە بێ زۆر جێگای دیکەش ئەم کۆسپەیان لەسەر رێیە. وەدەست هێنانی کاغەز لە بازاری ئازاد هەم سەختە وهەم پڕخەرجە.ئێمە مەبەستمان ئەوەیە نرخی سروە تێ هەڵنەچێ. لەلایەکی دیکەشەوە بەم شێوە بەشی هەموو ژمارەیەکمان بۆ جێ بەجی نابێ. بەهەرحاڵ بێتوو لەچاپدانی سروە بە کاغەزی باشتر هەرکات بلوێ لە سەرچاوی دادەنێین....

دەستەیەکیش لەخوێنەران لەسەر کەمبوونەوەی لاپەڕەی سروە گلەیی یان کردووە. ئەودەم کەگەلاڵەی مانگانە بوونی سروەمان بەدەستەوە بوو رامانگەیاند کەگرفتی دابین کردنی کاغەز لەلایەک وکۆسپی فەنی چاپ لە لایەکی دیکەوە (بەپێی کورت

ئەوەندە زۆر بووە کە بەراستی دەرەوەسی وەڵامی تایبەتی بۆهەموان نایەین.

بەر لە روون کردنەوەی ئەم بابەتانە دەبێ پێتان عەرز بکەین کەسەرنج و وردبینی ئێوە ئازیزان ئەو ئەوشارەی خستبوویە سەرشانی بەرێوەبەران و کاربەدەستانی ئەم ناوەندە جێی دڵخۆشی وهیواش بوو.

هەستی خوێنەرانی سروە " کە سروە بەهی خۆیان دەزانن وپێ بە پێ وەدووی باس وبابەت ومەبەستەکانی دەکەون وچاوەروانی ئەوەن وسێت وداخوازیان بۆ ئەملا و ئەولا بێتە دی و لەسەر چارەنووسی گۆوارەکە زۆر حەساسن .پشتیوان وهانایەکی گەورەیە بۆ هەموو ئەوانە کە لەم جیهادە پیرۆزە فەرهەنگی یەدا بەشدارن.

وێرای سپاس لە هەموان دەڵێین هەقی خۆیەتی ئێوە باروذۆخی کارەکە شێلگیرانە لەبەرچاو دەگرن وپرسیار و ئیلهامەکانی خۆتان بەئێمە دەڵێن. رەخنە لە کەمو کووڕی یەکان دەگرن و بە پێشنیار ورێنوێنی خۆتان رێ پێشاندەرمانن.

جا ئێستا وەختی ئەوە هاتووە لەباری کاتی دەرچوون و نێوەروک و.... سروە هێندێک تێبینی مان هەبێ.

کردنەوەی دوو بەشی ماوەی دەرچوون) دەبێتە هۆی ئەوە سروەکەم لاپەڕەتر بێ . دیسانیش بەڵێنی دەدەین هەرکات گرفتی کاغەز وچاپ چارەسەر بکرێ لاپەڕەکانی سروەش زۆرتر بکەینەوە و بزانن ئەم ویست وداوایەی ئێوەمان لەبەرچاوە.

ئێستاش ٨ لاپەرەی "بەرەوزمانی یەککرتوو" لێ زێدە بووە وئەم بابەتانەی بە لەهجە جۆرا وجۆرەکانی دیکە لەنێو گۆواردا چاپ دەکران لەوێدا کۆ دەبنەوە وجێی خۆیان بۆ بابەتی دیکە لێ دەکەن.(ئەم باسەمان لە سروەدا روون کردۆتەوە ) هیوادارین ئەم روون کردنەوە وتێبینی یە کورتە خوێنەرانی واقیع بین رازی بکا .

**پێوەندیمان**

بەرقەراری وبەردەوامی پێوەندی نزیک و تەنگاو تەنگ لەنێوان ئەمناوەندە وئێوە گەلی باش وبەشەرەف لەسەرەتاوە تا ئێستا یەک لەمەبەستی هەرە گرینگی ئێمە بووە وهەیە. لەم پێیەدا زۆرمان حەول داوە و زۆر گەلاڵەمان داڕشتووە تا ئەم نزیکایەتی یە پتر بێ وبەم شێوە لە لایەک ئێوەهەست بەوە بکەن کە سروە ئی ئێوەیە و پتری بەئی خۆتان بزانن و بۆ گەشە ونەشە و دەوڵەمەند کردنی حەول بدەن وپشتیوانی لێ بکەن ویارمەتی بدەن و بنکەی ئەم جیهادەپیرۆزە گەرمتر بکەن و لەلایەکی دیکەوە بە دیتنەوەی موخاتبی دیکە و تەنەوەی هەرێمی نفووزی خۆی لە هەڵدان و نەشەی رادەی ئاگاداری وفەرهەنگی گەلی ئازیزمان سەرکەوتنی بەراستی وەدەست بێنین .

قبل از هر چیز لازمست ازآن دسته از خوانندگان عزیزی که باارسال نامه اظهار محبت نموده و با پیشنهادات وانتقادات سازنده خود،راهنمائیمان کرده‌اند تشکر وسپاسگزاری شود . حقیقت اینستکه این روزها دوستان زیادی برایمان نامه نوشته وطی آن نظرات و

بروانە لاپەرەی ٤٦

# دیسانیش تێدە کۆشین هەرکات گرفتی کاغەز وچاپ چارەسەر بکرێ لاپەڕەی سروە زیاتر بکەینەوە

هەرچەند حەول ودەولی ئێمە بوو بەهەوێنی پێوەندی هەراو بەڵام پێداچوونەوەیەکی دەوی بۆ بردنەسەری چەندوچۆنی پێوەندی یەکان . درێژەی ئەم باسە بۆ ژمارەی داهاتوو هەڵدەگرین .

"خوا ئاگادارتان بێ"

دەلیلی ئیعتیراف :

ئێستا بۆ زۆربەی زانا و عاقڵی
رووناک بیر و دوور لەلاسایی وپێوەندی
داب ونەریتی خەڵک سەلماوە کە دنیایەک
بەرجی دونیای مادی ودەوروبەری ئێمە
هەیە و ئەگەر نەبا چۆن دەیانتوانی
ئەوان جووتێرێکی هیچ نەدیو لەخەو بکەن
و زۆر پرسیاری هەندەسە وجەبری لێ بپرسن
کە عەقڵی خەڵک سەری لەوان سوڕماوە .
هەمووشی بەڕاستی وەڵام داوەتەوە . دیسان
ئەوە سەلماوە کە قانوون وزاکوونی
تەبیعی زۆرجار رەنگە لەقانوونێکی دیکە
رێڕەوی بکا و لەڕێبازی سەلماوی خۆی
لابدا وئەوان بێ بایەخ بکا کە ئیمکانی
بوونی موعجیزەی پێغەمبەرانیش هەر لەو
سەرچاوە دەگرێ .

دیسان ئەوەش سەلماوە کە ئینسان
لەگەڵ دونیای رووحانی پێوەندی هەیە
جا چ سالح بێ و چ فاسید،یانی هەر
کەس بەپێی شوێن وهەڵوێستی سەبارەت بە
کاینات ودنیای رووحانی دەناسرێ .

جا ئەم عالەمە شوێنی پتر لەسەر
هەرکەس دانا بەهرەمەندترە و دەتوانێ
کەڵک وەرگرێ و هەڵدا ورێنوێنی بکا و
بەهرەوەرگرێ و بەهرە بدا، بیر و بڕواو
کردەوەی شایستەی هەبێ و بە خوو و
رەوشتی بەرز خزمەت بکا .دەنا پێچەوانەی
ئەوە دەبێ .

لێرەدایە کە ئەوانەی مادین و دان
بەدونیای مەعنەوی دانایەنن لە کردەوەی
خۆیان پەژیوان دەبنەوە وهەڵەی خۆیان
بۆ دەردەکەوێ ودەگەڕێنەوە هەرێمی پاک
و پیرۆز. جا ئەم باسە بۆتە هۆی ئەوە
کە ئیمان بەخودا و هەرچی لە لای
ئەوەوە هاتووە بێنن ولەبەر تیشکی ئەم
راستییانە لە لای زانا وپسپۆران ئەو
مەبەستەیان درکاندووە. عەقڵ پێ شکانی

ئەوان گەیشتن بە رێنونی پێغەمبەرانی
خودایە یانی ئەوە کە بەرجی ئەمدونیایە
دونیایەکی غەیبی هەیە کە هەرچی دنیای
رووح وفرشتە وپاشایە و هەرچی هەیە و
نیە لەبەر دەستی ئەودایە و ئەویش
کەسێکە کە رێ ورەسم وقانوون لەدەستەڵا-
تی ئەو بەدەر نین. یانی خودایە
خودایەک کە بەسەر تەواوی دنیاوقانوونی
دنیادا دەستەڵاتی هەیە وبەڕێوەی دەبا .
هێندێک دەسەلمێنێ هێندێک نا . هەر وەک
هێزێکی پاک وپیرۆز خەڵاتی هێندێک لە
پێغەمبەرانی دەکا وەک ئەوە ئاگر کاری
تێ ناکا یا شەپۆل و گۆڕی چینەکانی
فەلەک لە کەمترین کاتدا یا روح وەبەر
هێنانی شتێکی نەبوو. یا سەرنج دان بە
خوێنی پیس وخاوێن کردنەوەی لە میکرۆب
بۆ ئەوە کە (ابرص) رزگاری بێ یا بۆ
ئەوە کە رووحی غەیبی کە بەرواڵەت
بەستەبە لەشە پاش جوێ بوونەوە لێی دوور
بکەوێتەوە بەڵام لەکاتی دیاری کراودا،
زیندووی بکاتەوە.

ئەو کەسێکە کە هاچەری خەزێنەی دنیا
ـ ی غەیبی بەدەستە وڕێشمەی زەوی وهەموو
کاکێشانەکان لەبەر دەستی ئەودایە. جا
کەوایە پێغەمبەرەکانیشی بەرزو بەدەستەڵات
و مەزنن. هەرکەس ئیمانی پێ هێنان و
ئەوانی ناسی و وەدوویان کەوت قازانجی
کرد و رووحی چەپەڵ هەر ئەو رووحە
شەیتانەیە کە نەسەلماوە و هەرکەس
وەدووی بکەوێ لە ویستی نزمی مادی و
ئاواتی نەفسی ئەممارەدا نوقم دەبێ.بۆیە
خوا دەفەرموێ :

**" قداقلح من زکیها وقدخاب من دسیها ."**

"هەرکەس نەفسی خۆی پاک کردەوە رزگار
بوو و هەرکەس پیسی کرد خەجاڵەت بووە.

جا ئەم ئایەتە مانای ئایەتێکی
دیکەی خوداش روون دەکاتەوە کەدەفەرموێ:

**"واما من خاف مقام ربه ونهی النفس عن
الهوی فان الجنه هی الماوی"**

"بەڵام ئەوەی لە حوزووری خوا ولە
ئاستی گەورەیی ئەو ترسی هەبووونەفسی
خۆی لە ئارەزوو خاوێن کردەوە جێی
بەهەشتە." جا لەم نێوەدا دەستەیەکی
کەم لە زانایان دەڵێن کە مەبەست لە
نەفس خودی ئینسانە و ئەوانەی لەم
رێبازەدا رێڕەوی لەوان دەکەن زۆر کەمن.

وە بەڵام پێغەمبەرانی گەورە ومەزن
بەهۆی سەفا ونوور وئەوین کە لەدڵیانەوە
سەرچاوە دەگرێ وێڕای وەحی خوداوفەیزی
قودس کە خەڵاتیان روحیان کراوە، روحی
خەڵکیان بە بەردەست بوون وسەرنج بەرەو
خوا دڵبەند کردووە، جگە لەوانە کە
دێوجامەی تۆسنی و سەرەڕۆیی زاتی گرتوون
و لەڕاستی ورزگاری وهیدایەت روویان
وەرگێڕاوە.

**دەلیلی مەعریفەت :**

لەنێو ئەو شتانەی سەرنجی ئەربابی
مەعریفەتی راکێشاوە ئەوەیە کە ئینسان
بۆ ئەوە خولق نەکراوە تا بێ گەورە و
لاپەرەسەن و بەرەڵڵا بێ چون عەقڵ و
دەرکی مرۆڤ لەوە دوورە کە کابرا
خانووبەرەیەکی جوان ورەختە و بەرفرە
ساز بکا وبە سلسلە وپلپلەی جوان
بیڕازێنێتەوە وبە لامپای جوان بیڕەنگێنێ
وشەم وچرای جوانی وێخا و ئەوەی لە
دڵدا نەبێ کە لەم خانووەدا پیاوی یەکە
یەکە ومەزن ودۆستی خۆشەویست و زانای
بەناوبانگ بێ وشانازی یان پێوە بکا و
پڕی بکا لە شێت وگێژ و ماخولیا.

خوای پاک ومەزن ئەم دنیای خولقاندووە
وبە ئەستێرەی جوان رەنگاندوویەتی وبە
گوڵ نەخشاندوویەتی و چۆم و رووباری
بۆ ساز کردووە ومیوەی رەنگاورەنگی لێ
پەیدا کردووە، هەر سەبارەت بەحەیوان
و جڕوجانەوەری خەڵق نەکردووە بەڵکوو
ئەم جیهانەی بە هەموو شتێکی کە تێی
دایە سەبارەت بە ئەشرەفی مەخلووقات
یانی بەشەری ساز کردووە. جا کەوابوو
باشترین - وڕێک وپێک ترین ئیمکانی داوە
و باشترین خزمەت وتاعەتیشی دەوێ کە
ئەویش ئیتاعە و فەرمانبەری لە ئەمری
هەق وسوجدە لە بەرابەر ئەو وبە پاکی
یادکردنی ئەو ووەحدەت وتەسلیم بەئەوە.

گەیشتن بەم مەبەستانەش بێ مەعریفەتی
تەواو نالوێ وئەم مەعریفەتەش بەتەعلیمی
پێغەمبەری گەورەی نەبێ پێک نایە بۆیە
خودا دەفەرموێ :

**"یا ایها النبی انا ارسلناک شاهداً و مبشرا
ونذیرا وداعیا الی الله باذنه وسراجا منیرا"**

" ئەی پێغەمبەر ئێمە تۆمان نارد،
تا لەنێو خەڵکدا بەشاهید بی ومزگێنی
بدەی و بترسێنی وبە ئەمری خوا خەڵک
بەرەو ئەو رێنوێنی بکەی. تۆ وەک چرا
رووناکی دەر و وەک مانگ رۆشن کەرەوەی
کوێرە رێی ژیانی خەڵک بی ."

تا ئێره له فه‌لسه‌فه‌ی پێغه‌مبه‌ران و قازانجی ئه‌وان ئاگادار بووین. ئه‌وجار هێندێکیش باسی خۆش ویستنی پێغه‌مبه‌ران ده‌که‌ین .

خوای ته‌باره‌ک وته‌عالا ده‌فه‌رموێ :

"قل ان کان اباوکم وابنائکم واخوانکم وازواجکم وعشیرتکم واموالاً قترفتموها و تجاره تخشون کسادها احب الیکم من الله ورسوله و جهادفی سبیله فتربصوا حتی یاتی الله بامره والله لایهدی القوم الفاسقین ."

" به‌خه‌ڵک بڵێ که ئێوه وباب وکوڕو برا وخیزان وکه‌س وکار و ئه‌و ماڵه‌ی په‌یداتان کردووه وئه‌م مامله‌ی له زه‌ره‌رو

خوا و ره‌سووڵاندا بزانێ هه‌ره‌شه‌ی لێده‌ک

جا که‌وایه خۆشه‌ویستی و دۆستایه‌تی خو

و ره‌سووڵ به‌سه‌ر هه‌موو ئه‌وینێکی دیکه‌و

هه‌یه و له‌وان واجبتره .

حه‌زره‌تی ره‌سووڵ(د.خ) فه‌رموویه‌تی:

"لایومن احدکم حقی اکون احب الیه من

ولده ووالده والناس اجمعین ."

"که‌س به ئێوه ئیمان نابا مه‌گه‌ر

ئه‌وه که من له لای عه‌زیزتر بم له‌کوڕ

وباب و هه‌موو که‌سی."

له‌وه‌ڵامی یه‌کێک دا که‌باسی قیامه‌تی پرسی

فه‌رمووی: " تۆخۆت مه‌حبووبی چون ده‌ڵێی

خوا وپێغه‌مبه‌رم خۆش ده‌وێ. که‌وابوو خوا

# النبی اولی بالمومنین من انفسهم وازواجه امهاتهم

**خرابی** ئه‌و ده‌ترسێن وئه‌و خانووبه‌ره‌ی دڵخوازی ئێوه‌یه له لای ئێوه له خودا و ره‌سووڵی ئه‌و وجیهاد له‌رێگای ئه‌واندا خۆشه‌ویستره، ده‌جا چاوه‌ڕوان بن تا غه‌زه‌بی خواتان به‌سه‌ردا بباری چون خودا فاسقان هیدایه‌ت ناکا .

خوای مه‌زن هه‌رکه‌س که ئه‌وینی خۆی و ده‌ست وپێوه‌ندی خۆی به‌سه‌ر ئه‌وینی

و ره‌سووڵ تۆیان خۆش ده‌وێ. ئه‌وینی دڵ و خۆشه‌ویستی ودڵبه‌ندی خۆشه‌ویسته سه‌باره‌ت به‌خۆش ویستوو. جا هه‌رچی خۆشه‌ویستی که‌سێک به شتێک پتر بێ ئه‌وینه‌که‌شی به‌م پێیه ده‌گۆڕێ. نیشانه‌ی خۆش ویستنی حه‌زره‌تی ره‌سووڵ سڵه‌وات لیدان و یاد کردنی ئه‌وه به‌تایبه‌تی ئه‌و وه‌خته که له زمان یه‌کی دیکه‌وه ناوی ده‌برێ یا

باسی دەکرێ یا وەختی زیارەتی رەوزەی نوورانی ئەو.

جا رێڕەوی وخۆشەویستی کتێب و سوننەتی ئەو مایەی سەعادەتە.خۆشەویستی ئالْ وئەسحاب ورێڕەوانی ئەووخۆشەویستی قاری قورئان وحافز وموحەدیس وئیمامی موجتەهید وعالم وسەدیق وشاهیدوشایستە کاری ژن وپیاو وێڕای خۆشەویستی حەزرەتی محەممەد (د.خ) پێویستە.

بەلاّم بەڵگەی حەزرەتی رەسووڵ لەسەر گەورەیی وپیرۆزی قورئان و کرنۆش لە بەرامبەر ئەودا ئەم ئایەیە.

" اناارسلناک شاهدا "ومبشرا "ونذیرا "

بعضا ".

" بانگی حەزرەتی موحەممەد وەک بانگ هیشتنی خۆتان حیسێب مەکەن وەک ئەوەکە هێندێک هێندێکی بانگ دەکەن.

مەبەست ئەوەیەکە فەرمان و ئەمری حەزرەتی رەسووڵ ورد و درشت لەرووی ئیمان وبە دڵ و گیانەوە لەسەر چاوان دابنێن.

زۆر ئایەتی دیکەش هەیە بەلاّم لە کۆتاییدا دوو ئایە دێنینەوە:

**النبی اولی بالمومنین من انفسهم و ازواجه امهاتهم.**

" پێغەمبەر لەلای ئیمانداران،

# پێغەمبەرلای ئیمانداران لە نەفسی خۆیان عەزیزترە و ژنەکانی ئەو دایکی موسڵمانانن

ولیومنوا باللەورسولەوتعزروەوتوقروە."

یا موحەممەد ئێمە تۆمان وەک شاهیدو مزگێنی دەر وترسێنەر بۆ هەموو خەڵک نارد تا بە موسڵمانان بڵێی بە خوداو رەسوولی ئەو ئیمان بێنن. وپێغەمبەریشیا ن خۆش بوێ وڕێزی لێ بگرن."

یسان فەرموویەتی:

لا تجعلوا دعاالرسول بینکم کدعا بعضکم

لەنەفسی خویان عەزیزتر وگرینگترە و ژنەکانی ئەو دایکی موسڵمانانن.

" قل ان کنتم تحبون اللەفاتبعونی یحببکم اللە."

" ئەی موحەممەد بە خەڵک بڵێ ئەگەر خوداتان خۆش دەوی ئیتاعەی من بکەن تا خوا لە ئێوە خۆش بێ و رەزا بێ و خۆشی بوێن.

## وت وویژ لەگەڵ مامۆستا هەژار

لە ورمێ تووشی بووم. لە چەرمەسەری ڕۆژگار توورە
لەماڵی دوستێک وەک هەمیشە
قوتوی سیغار و تووتن و
پەر ومۆدنە و دووکەڵ و
کتێب گەماڕۆیان دابوو.
بەشوێن ئیشەکی تایبەتی دا
هاتبووە ورمێ ولەم ئیدارە
بۆ ئەو ئیدارە،لەو شوێنە
بۆ شوینێکی دیکە وهەزار
بەڵێنی وقەرار و مەدار.
دەمزانی بۆ پیرەپیاوێکی
بێ هێزوتێک شکاوونەخۆشی
وەک ئەو ئەم هات وچوون
و ئێروئەوێ کردنە چەندە
دژوارە.لەسەر ئەوەش را،
هاتبووم وت و وێژێکی
"ئەدیبانە"ی دەگەڵ بکەم
و تۆماری دەروونی بپشکنم
وئەوەی دەمەوێ لێی وەرگرم.
وەختێکی باش نەهاتبووم
نێوچاوانی گرژ و هێندێک

بوو. بە دیتنی من وەک
هەمیشە هێندێک کراوە و
بەخێرهاتنێکی گەرمی کردم.
هێشتا بەسەر پێوە بووین
پێمگوت:

– هاتووم بۆ "سروە"
وت وویژت دەگەڵ بکەم.
بە لالووتی گوتی:
– وەرە دانیشە برێک
جەفەنگ لێدەین ماڵ خراپ
ئەوە دەمرم. نازانی چەند
ماندووم. چ وەختی ئەو
قسانەیە!

مامۆستا شەوێکی دوورو
درێژە وهەردەبێ قسە بکەین
"ئەدەب" و "ئەدەبیات"هەمیشە
بۆ من پرسیارن. هەردووک
واژە عەرەبین. مانایان
چیە؟

مانای ئاسایی «ئەدەب»

دەزانی. "بەشەرم وحەیا". ئ
لەخۆ. "ئەدەبیات" ب
بەشە لە وتار دەگوت
کە کاری بەریازی وزانس
وشتی عیلمی یەوە نەبێ
بەو حیسابە هەرشتێک
زانستی و ریازی نەبێ،
مەسەلەن قسەی کووچە
بازاریش دەبێتە ئەدەبیا
نەخێر."ئەدەبیات" ل
بەستێنەدا کە ئێمە باس
دەکەین هەڵگری بار ومانا
تایبەتی خۆیەتی. چیرۆک
داستان وشیعروئەو شتانە
دڵبزوێن وهەست خرۆشێن
لە کوردیدا ئێستا ب
ئەدەبیات دەڵێن"وێژە" پێت
چۆنە؟

زۆر باشە. جێگای خۆی
کردۆتەوە. وێژەوانیش لەجیا
تی "ئەدیب" دەکار دەکرێ.
واژەی "شیعر" ئەویش
هەر عەرەبی یە.مانای چیە
وچۆنی تاریف دەکەی؟
"شیعر" یانی هەست و
شعوور. کە دەڵێن شاعیر
یانی "خاوەن هەست"
هێندیک نووسەر لەجیات
شاعیر دەڵێن "هەستیار"
کەیفم دەیگرێ.مەلا جەمیل
وای دەنووسێ. زۆر کەسی
دیکەش. پڕ بە پێستە.
شاعیر و هەستیار یەکن.
ئەوجار شاعیر یا هەستیار
کەسێکە خاوەنی هەستێکی
تیژتر بێ وزۆرتر وزووتر
لە خەڵکی ئاسایی هەست

به شت بکا .پەخشان نووسێکی باشیش بەلای منەوە هەر شاعیرە. رووسەکان بە ماکسیمگۆرکی دەڵێن شاعیر. مەقیانە وراست دەکەن. هەر چەند کەرەسەی شیعری وەک وەزن وقافیەی دەکارنەکردووە بەڵام هەر شاعیرە.

لە نووسینی کوردیدا لە جیات شیعر واژەی وەک هەڵبەست وهۆنراوە دەکار دەکرێ. کامیانت پێ باشە؟

هیچ کامیان! هەڵبەست و هۆنراوە هەردووکیان بەرامبەری"نظم"رادەوەستن. ئەوەی بزانە هەر وەک "ناظم" نابێتە "شاعیر". (نظم)یش نابێتە شیعر. کابرات دیوە لەداوەت و هەڵپەرکێ دا چەند "ناظم"ە وچۆنیان دەهۆنێتەوە،هەرچی دەیلێ وەزن و قافیەی هەیە ورێک وپێک وەک دەلێ

"هاتووم لەلای لاجانێ
باریکەی نەشمیلانێ

ئەوە هۆنراوەیە. نەزمە. شیعر نیە.

کەوابوو جەنابت واژەی "شاعیر" ناگۆڕی.

بەڵێ. ئەوەش لەبیر نەچێ من جاران بە نەزمم دەگوت " هۆنە".

راستە. دیتوومە لە جێگایەک لەجێگای " نظمو نثر" (پەخشان و هۆنە) ت دەکار هێناوە کە تەواو پڕ بە پێستە.

لە ولاتی خۆمان بە کابرایەکی زۆر چاکی شیعر گوتبا دەمانگوت "خۆوێژ" "شایەڕ"یشمان هەیە. هەر "شاعیرە"کەی عەرەبی یە گۆڕاوە. بەڵام پێمان عەیبە بەکابرای باسەواد بڵێین شایەر. دەنا شاعیرو شایەر هەریەکن. دیارە شاعیرێکی کە زۆرتر نازمە دەبێتە "شایەر".

یانی پێت وایە "شایەر" گۆڕاوی "شاعیرە"؟ من خۆم پێم وانیە. پێم وایە شایەر لە واژەی "شایی" دروست کراوە وناوی فاعیلە یانی هەڵسوورێنەری شایی وەک ئاشێر کە کاری ئاشی بەدەستەوەیە. مەبەستم ئاشەوان نیە.

ئەمن پێموایە (شاعیر"ە بۆتە "شایەر" ئەتۆش بە کوردی دەزانی وبە مانای شایی گێڕ، کەیفی خۆتە.

با دەست لەدۆزینەوەی ریشەو بنەمای واژە هەڵگرین مانای شیعر چیە. چۆنی باس دەکەی؟

هەستێکی ناسک وزەریف یانی شیعر. لەپێشەوە باسی هەست و شعوورمان کرد.

لەسەر یەک پێت چۆنە بڵێین "شیعر" یانی بەرهەمی بزوێنەری فکروبیری ئینسا ـ نێکی خاوەن هەست؟

دەگەڵتم، زۆر باشە. ئەوەش دووپات کەینەوە هەڵبەست وهۆنراوە دەبێتە کەلامی "منظوم".

بچینە سەر مێژووی شیعری کوردی. لە کەنگێوە شیعرمان هەیە؟

شیعرە ئایینی یەکانی ئەهلی حەق و"علی اللهی" یەکان وەک " سەرەنجام" دەگەڕێتەوە هەشت سەت ساڵ لەمەوبەر. ئەوەش بۆیە ماوەتەوە چونکە ئایینە و ئایین خۆشەویستەودەپارێزرێ هەروا دێینە پێش وباسی عەلی حەریری و دوایە مەلای جزیری وخانی و....دێتەگۆڕ.

لەو تاریخە دوور و درێژەدا شاعیری گەورە و هەڵکەوتەمان زۆرن. کامیان زۆر پەسند دەکەی وبۆچی؟

بڵێمچی؟ دەزانی چیە. پیاو دەچێتە نێو باغ. باغی پڕ گوڵ ومیوە هەر یەک لەرەنگێ،هەریەک لە تامێ، بەبۆنی خۆشی تایبەتی خۆیەوە. پیاو بلێ کامیان پەسند دەکەم؟ هەموویان پەسند دەکەم هەریەکەی بە دەلیلێکی تایبەتی.مەولەوی تاوەگۆزی بەو خەیاڵە ناسکەیەوە. نالی بەو قودرەتەوە،شیعر بەدەستێەوە نەرمە. بەکەیفی خۆی واژە بە مانای جۆراوجۆر دەکار دێنێ. چۆن ئاسن بەدەست حەزرەتی داودەوە نەرم بوو ئەویش ئاوا بەسەر شیعردا زاڵە. شتێکی غەریبە. زۆری

وامان هەن. دیارە هەموو
لە رادەیەکدا نین. سالیم
و عەبدوڵڵا بەگی میسباحیش
هەن کە زۆرم پێ شاعیر
نین .

زۆربەی ئەدەبیاتی ئێمە
لەشیعر پێک هاتووە. بۆچی
وایە؟ چۆنی بۆ دەچی ؟
جارێ با ئەوەت پێ
بڵێم بەشی زۆری ئەو
شیعرانە نەزمن نە شیعر !
بەیتەکانیشمان لەبیر نەچێ
کە لەریزی شیعردان وبە
لای منەوە جوانترین بەشی
قەوارەی ئەدەبی کوردین .
پەخشانمان زۆر کەمە .ئەوەی
هەیە شیعرە . ئاناتۆل فرانس
دەڵێ نەتەوەی دواکەوتوو
شیعری دەوێ.کە پێشکەوت
وپلەوپایەی زانست وئاوەزی
رۆیشتەسەر ئەوجار پەخشانی
دەوێ.

شیعر بەدرێژایی مێژووی
گەلەکەمان هەر بووە و
فرچکمان پێ گرتووە. کەس
گوێی نەداوەتە پەخشان —
نەشمان بووە — بەلام هەموو
گوێ قوڵاغ بوون شیعر ببیسن
شیعر دە دڵدا دەمێنێ.
لەبیر ناچێ.

لەمەر بەیتەوە باسان
بکەین . لەبیرمان نەچێ .
قەدیم ئاغا وپیاوی دەست
رۆیشتوو بەیت بێژ و
حەکایەتخوانیان رادەگرت .
کابرا بە بەیت گوتن بەرێ
دەچوو. کارەکە پایەی
ئابووری بوو. جا حەولی
دەدا فێر"بێ" و کوڕ و
منداڵیشی فێر کا. نانی
تێدا بوو. بەلام ئێستا
رادیۆ وتەلەویزیۆن وشریت
و زەبت پەیدا بوون و
کابرا «بەیتبێژ» راناگرێ.
لێرەدا زەرەرێکی گەورەمان
وێ کەوتووە. جا مەگەر
بەنووسین تێی هەڵێنینەوە.

— خودا یاربێ دەبێ
حەول بدەین. هەر ئێستا
زۆرکەس لەسەر بەیت کار
دەکەن.کۆیان دەکەنەوە و
دەیان نووسنەوە.

— زۆر درەنگ وەخۆ
کەوتوون. زۆر شت نەماوە
کابرایەک لە نۆبار بوو.
هیچ بەیتێک نەبوو نەیزانێ
دەروێش عەولاێکمان بوو بە
تەرەغەدا[3] دەهات و دەچووە
زیارەتی شێخ. لە بەیانی را
دەیگوت تا شەو.لێی نەدە-
برا . کەس لە فکری ئەوەدا
نەبوو بیان نووسێتەوە .
ئەوان مردن و رۆیشتن
ئێمەش ئەو هەموو شتەمان
لەدەس چووا .

— ئێستا کەباسی بەیت
دەکەین با ئەوەش روون
کەینەوە ئایا بەیت وەک
سەبکێکی ئەدەبی بەرهەمی
ئاڵ وگۆڕی کۆمەڵایەتی و
ئابووری و هەل ومەرجی
تایبەتی یە وفەوتان ونەمانی
دیسان بەرهەمی ئاڵ وگۆڕی
شێوەی ژیانی گەلی کوردە؟
دەزانین لە ئەدەبیاتو
فارسیشدا سەبکی ئەدەبو
جۆراوجۆر هەیە.وەک سەبکی
خوراسانی ،عێراقی، هیندی
و... ئایا بەیت لە
ئەدەبیاتی کوردیدا شتێکی
ئاوایە ؟ چۆنی بۆدەچی ؟
ئایا ئێستا کەس ناتوانێ
بەیت بڵێ ؟

— هەروەک بۆخۆت دەڵێی
ئاڵ وگۆڕی هەراو لە هەل
ومەرجی ژیاندا دەبێتە
هۆی ئاڵ و گۆڕ لە
ئەدەبیاتدا . هەروەک باسمان
کرد ئەورۆ بەیت و باو
نانی پێ پەیدا ناکرێ .
دەجا دەبێ بمرێ! دەردێکی
گەورەی دیکە ئەوەیە ئێمە
لە مەدرەسەمان خوێندووە و
پێمان وایە نابێ وەک
عەوام چاومان لێ بکەن .
دەستمان کرد بە شیعری
عەرووزی. پێمان وابوو نابێ
وەک عەلی بەردەشانی شیعران
بڵێین. کەچی قەتیش نایگەینێ
لەگەڵ مامێمن لەسەر ئەوە
شەرمان بوو. لە بەیتمان
لادا وخۆمان لەبیر چوووە
ئەفسووس ! تۆ چاو لەو
بەیتانە کە. شتی سەیر و
سەمەرەیان تێدایە! دەبینی
هەشت ،نۆ، دە قافیە بە
دوای یەکدا دێن. لەپڕ
بەیتبێژ هەڵی بڕیوە بۆ
ئەوەی قافیەیەکی دیکە
دەکار بێنی ! جاری وایە
پازدە ،شازدە قافیەی هێناوە.

**مانیعی چیه با دوو سێ قافیەش وێک نەچن ؟ کەچی بەناشکوری نەبێ ئەوانە هەموو لەبەر چاوی ئێمە فەوتان وتێداچوون وئێمەش پێمان وایە دەبێ لاسای عەرەب وفارس بکەینەوە و شانازی بەو کارەمانەوە بکەین ! جا لە لایەک نەگەیشتینە ئەوان و هی خۆشمان لەدەست چوو! .نەقلی قەلە رەشە و کۆترە کە رووی لێ داین ا .**

– بەتێگرایی گۆواری "سروە"ت پێ چۆنە . بە پەخشان وشیعروبابەتەکانیەوە چۆنت دێتە بەرچاو ؟

**– پێم زۆر ،زۆر ،گۆوارێکی باشە . درێژە بە کارتان بدەن. هەموو بابەتەکان دەخوێنمەوە . هیوام وایە مەحدوود نەبن . ئازادی قەلەمتان بێ. مەحدودیەت لێتان تێک دەدا .کۆنترۆل قەیدی نیە . شتی وای تێدا نەبێ زەرەری بۆ پەز بێ.**

– رێنووسی سروەت پێ چۆنە ؟

**– من دەگەڵ دوو (و) نیم. شتێکی زیادی یە . بروانە ئەلف بێتکەی فارسی چەندی کەموکووڕی هەیە ؟ خەڵک فێریش دەبێ.**

راستە ئەلف بێتکەی زۆر زمانان کەموکووڕیان زۆرە. ئێمە دەمانەوێ تووشی ئەم گیر وگرفتانە نەبین. ئەگەر لەگەڵ دوو (و) نی ئەدی لە نووسین دا «کور» و «کووڕ» چۆن لێک دەکەیەوە ؟

**– خوێنەر بەجێگە لە مانای واژە دەگا . دەزانێ ئەم واژە لەم رستەدا مانای چیە . شت لەخۆتان زیاد مەکەن. خەڵک عادەت دەکا . بۆخویان فێر دەبن**

– زمانی سروەت پێ چۆنە . ئێمە بە کوردی ناوەراست دەنووسین. تاک وتەرا پەیدا دەبن کە: بۆ بە کوردی شیمال وجنووبیش نانووسن. وەک مامۆستایەکی نێوبەدەرەوەی شارەزا لەو بارەوە چ دەفەرمووی ؟

**– ئەمن لە شەرەفنامەدا کارێکم کردووە . نازانم چاکە یا خراپ . کوردیم تێکەڵ کردووە . لەهجەکانم لێک نیزیک کردۆتەوە .ئەوەی لە سروەدا دەی بینم زۆرم پێ جوانە . هەر بەولەهجەیە بنووسن ومەیگۆڕن. بەلام لە واژە و تەرکیباتی لەهجەکانی دیکە کەڵک وەرگرن. ئێمە لەبەرامبەر "دەریا "دا دەڵێین "وشکانی" بەلام کرمانج (بادینی) دەڵێن "بەژ" مالم قەبرە "بەژ" لە "وشکانی" جوانترە . دۆینێ لە شنۆ بووم .باسی (مووسڵی) کرا ئەوان پێی دەڵێن "زیسک". دەجا وەڵلاهی "زیسک" لە "مووسڵی" جوانترە**

– رەنگە تامیشی خۆشتر بێ ! قوربان ئێمە بۆ پێک هێنانی زمانی یەکگرتوو ئەو کارە دەکەین و تا ئێستاش رانەوەستاوین. مەسەلە شێوەی دارشتی رستە- یە . مەبەستم ساختومان و رێزمانی رستەیە .کرمانجەکان دەڵێن دەبێ لەو بارەشەوە زمانی سروە بگۆرێ.جەنابت بەو کارە رازی ؟

**– نا . ئەوە نابێ . دەبێ وردە وردە لە هەموو لەهجەکانی دیکە واژەی جوان و تەرز ولەبار بێتە نێو ئەو زبانە کە سروەی پێ دەنووسن. ئەڵبەتە نەچن هەر واژەیەکی تووشی بوون بەکاری بێنن. تەنیا بەو دەلیلە کە بادینی یە . ئەوەش مەکەن.دەبێ جوانترین لۆغەت هەڵبژێرن. لەبیرتان نەچێ تا خەڵک رادێنن بۆ نووسراوەکانتان فەرهەنگۆک بنووسن.**

– یانی گۆرانکاری یەکی بنەڕەتی پێداویست نیە و تەنیا رێنوینی تان ئەوەیە لەباری واژەوە لەزاراوەکانی دیکە کەڵک وەرگرین ؟

**بەڵێ . هیچی دی .**

دریژەی هەیە

# مەیلی تەنیایی

**ش. فەیزی نەژاد**

ئەرێ بابە تۆ چت داوە بە سەر منەوە بۆ لێم ناگەرێیت؟ دۆستی دۆست بە، دوژمنی دوژمن بە . من دەڵێم پێم خۆشە تەنیا بم، تۆ دەڵێی دەچی خۆت دەکوژی ا تەنیایی چی داوە بە سەر خۆکوشتنەوە. من تازە خەریکم عادەتی بێ جێ تەرک دەکەم چۆن دەچم خۆم بکوژم. وەڵڵا مـردن ببینم حەوت فەرسەق هەڵ دێم شێت هەم بەڵام نەک ئەوندە .

دوای ئەم وتو وێژە لە رەفیقەکەم کە هەمیشە بە یەکەوە بووین جیا بوومەوە دڵم خۆش بوو گوتم مەیکە ئێستە دەچم بۆ پارک لەو جێگەی واخۆم دەزانم ،رێگەی هیچ دۆستو ئاشنایەکی تێ ناکەوێت دا دەنیشم. برێک بیر لە ژیانی خۆم دەکەمەوە ،یای ئازیزانی دوور ولات بکەم و نەختێ لەم جەماوەرە حاڵ نەزانە دوور بکەومەوە.

سەعات نۆ ونیوی بەیانی رۆژێکی هاوین بوو تا سەعات بەرە و دوازدە دەچوو هەوا گەرمتر دەبوو بەڵام پێم هەڵ خست* و بەرە و پارک وەرێ کەوتم. سیغارم تازە تەرک کردبوو، دەتوت دەسگیرانی خۆشەویستم جواب کردوە لەحاڵی خۆم وەرەز بووم. لە بەر درگای پارکەکە سێ چوار دەست فرۆشخەریکی قاو وقیژ وهەرا بۆ فرۆشتنی وردە والەکەیان بوون. یەکیان دەیوت: (بەهـ لە بەر ئەو چەقە دووکەڵە. سیغاری تیر بە بەستە و بە دانە ) سینگم لە نێوەوە هەڵ دەقولا، هەر وەک بیەوێت زاری دا بچڕێ هەرچی سیغارە هەڵی لووشێ بەڵام بە بەلای خۆمەوە ئیرادەم بەهێز دەکرد ئەویش لە تەرکی سیغارەوە هەموان دەدزیەوە، چۆلگەیێکم پەیدا دەکرد و خۆم تێ داویشت لە نێو وجوودی خۆمدا نوقم دەبووم، بە سواری ئەسپی خەیاڵ لە جیهان دوور دەکەوتمەوە ئەم پەرو ئەوپەری فەزام لە ژێر پێ دەنا ، ئەمجار دەهاتمەوە دەستم پێ کردبوو تا بگاتە وردە عادەتەکان وەک سمێڵ کرۆژتن.

تووشی تەنیایی بووم و عادەتی تەنیایی شم دەمێکە لە گەڵە. لەو دەمەوە کە هەستم کرد شتێک لە زاتم دا هەیە و ناوی هەستە لەوەدەمەوە لەززەتم دەرک کرد پەیم بە تامەزرۆیی خۆشی تەنیایی برد و گەلێک جار خۆم لە لە نێو دەریای خەیاڵ بۆ پەیدا کردنی بیرورایێکی تازە گوێچە ماسیەکانم دەشکاند. وەکوو جاران بە پەلە پروزی خۆم گەیاندە ئەو دیو درگای پارکەکەوە . لە پڕ دەنگی بەرزە وە بوو .منی بانگ کرد و بە دوادا قاقا پێکەنی . زانیم کێ یە هاتم خۆم بکەم بەگێل. بەڵام بە لرخەلرخ پێکەنینەکەی

بڕێەوە . دیسان بانگی کردم
چارم نەبوو لام کردەوە* دیم
(س)ی خزمە کە بە هۆی برێک
رووداوی کۆمەڵایەتی وکەمتەر
خەمی کەس و کاریەوە ،سیمەکانی
مێشکی تێکەڵ بووە لە پەسا*
مژلە جگەرە ویژەکەی دەداتو
پێ دەکەنێ. نەک لە بەرئەوەی
کەللەی کار ناکات بمەوێت
خۆمی لێ لادەم نا بە چەن
دەلیل هەروەکوو جاران کەوای
لێ نەهاتبوو لە گەڵی دەگەڕام
هەوەڵ خزمایەتی دووهەم
ها و تەمەنی سێهەم دۆستایەتی
پێش ئەو کارەساتە . چوارەم

دەکەن و بە قسە چەپوراست
کردنی شێت پێ دەکەنن. بەو
دەلیلانە ئەرکی سەرشانم
بوو هەرچی بێکار و وێڵ بووم
زۆر بکەم لە خۆم و چەند
دەمێک هاورێیی بکەم. بەڵێ
زۆری قەراخ لێ نەکێشم ،چوومە
بەرەوە دانیشتم . هێشتا چاک
و خۆشی تەوا نەببوو ،دەستی
کرد بە خوێندنەوەی شیعر و
گێڕانەوەی نەقڵ و قسەی خۆش
بەلام چونکە هەر کامێکیانم
دەیان جار لێ بیستبوو ،بەزۆر
بزەییکم دەنا بەسەر لێومەوە
جار جاریش قەراخ لێوم بە

خۆم گێل کەم ، بەشل وشەوێقی
بام داوە بۆ ناو دارەکانی
دەستی راستم . هەرای لێ
کردم : بۆ کوێ ؟جوابم
نەداوە. دیسان هەرای کرد
ئەوە بۆ کوێ فرکە فرکتە؟
وێستام ، لام کردەوە پێکە-
نینێکی وەرەزانەم تەحویلدا
دەستم رایەڵ کرد بۆ ناو
دارەکان وتم: هۆ لەوێ بن
دارێک هەیە هەرچی مەیلی
تەنیایی بکەم دەچم لەوێ
سەعاتێک دادەنیشم . دیاربوو
کاکم بێ رەفیق و بێتاقەت
بوو. هەرچەند دەیزانی زۆرم
بۆ هاتوە دەنا ئەوندە بێ
تەعارف نیم ، لە ناچاری
خۆی پیا هەڵ واسیم: منیش لە

وەقاییم ترین دەلیل ئەوەیکە
منداڵان وە ئەو کەسانەی بە
ئازاردنی بێ دەستەڵات شاد
دەبن بە بوونی من لە گەڵی
نەتوانن عەزیەتی کەن.
کسانێک هەن ئەوندە فەهم و
شعووریان کورتی دێنێت ، کە
بە چاوی سووک لە کومەڵدا
لێ یان دەروانن جا ئەوانەش
عوقدەی خۆیان بە سەر
کەسانێک وەک ( س) دا خاڵی

نرخی پێ کەنین کێش دەدا
نیزیک سەعاتێک رای گوتم تا
ئاخری لە پڕ هەستا بە بێ
خوداحافیزی رۆیی. ئەمنیش
لەخودام دەویست . لە
خیابانی ناوەراست پارکەوە
بە بالە تەپێ* سەرەو ژوورەوە
بووم . هێشتاوە هنگاو
نەرۆییشتبووم چاوم بە کاکم
کەوت گوڤاریکی بە دەستەوەیە
روو بە رووم دێت . ویستم

بەیانیەوە هاتوومەتە دەرەوە،
دوستێ،کەسێکم تووش نەبوە دوو
قسەی لەگەڵ بکەم. لە دڵدا
وتم هەی خۆزگەم بە خۆت. من
هەر لای رەفیقەکەم وتم بە
زمانی سووتاوەوە : خەیاڵم هەیە
ئاڵ و گۆڕێک لە وەزعمدا
بە دی بێنم، دڵم تەنگەوحەز
بەتەنیایی دەکەم پیی وابوو

وابوو دەچم خۆم دەکوژم. بە ئامان و زامان لێم نەدەگەڕا. لەم بیرانەدا بووم کە دیم کاکم بە گەرمی لە مەتڵەبی ئەو گوڤارە فارسیەوا بە دەستیەوە گرتوویە قسەدەکات: واکامپیوتێر دونیای داگیر کردوە و گۆڕیویە، قەت هەڵە ناکات. ژاپۆن وا عیلمی ئەلەکترونیکی پێش کەوتووە، سەد هەزار ئینسانی دەستکردی دروستکردوە. بە زۆر خۆم مەجبوور دەکردقسەکانی حاڵی بم. نەوەک بە بۆمەیلیم بزانێت و دڵی بیەشێت. هەروا لەنێو دارەکان روو لە چۆلگەکەی خۆم دەڕۆیشتین تاوتی بالە سەر ئەم تەختە سمیتە دانیشین، بە ئەو پەڕی نا بە دڵی لە گەڵی دانیشتم سەعاتێک لە کامپیوتێر دوا تا باش بوو مەتڵەبەکە تەواو بوو منیش لەو ماوەدا غەیری بەڵێ هیچم نەوت نەوەکوو قسە درێژتر بێت. لە ناڕەحەتی دا هەزار دەرد رووی لێدا بووم. برسیم بوو توونیم بوو مەیلم لە سیغار بوو لە بەدبەختی من کاکیشم جگەرەی دەکێشا ئەویش ئەو مژانەی ئەوە. گەرمای نیوەڕوی هاوین گەرم دای گرساند بووم. کراسە ناسکەکەم لێ ببوو بە بەڕە دەمم وشک بوو. کەڵلەی سەرم ویزە ویزی لێوە دەهات. زۆر سەیرە هەناسە هەڵ کێشانم لێ بوو بە کاسە کێشان. لە

تەواوی نیعمەتی دونیا غەیری تەنیایی هیچم نەدەویست ئەویش نەدەهات بە دەستمەوە تا پشووم هاتەوە بە خۆمدا کاکم مەتڵەبی دووهەمی دەس پێکرد. ئەمجار نەک ئەوەی بە کوردی بیگێڕێتەوە بە فارسی لە رووی گوڤارەکەوە دیخوێندەوە. تاوتار و پاراگرافێکی پێ خۆش نەدەبوو

دەستی لە خوێندن هەڵ گرت و کەوتە راوی مێش، قنج بوومەوە بە گورجی هەستاموتم کاکە ئەو بندارە بۆ من زۆر دڵگیرە. بمبوورە حەز ئەکەم نەختێ بە تەنیا لەوێ رابوێرم. هێشتا کاکم بە تەواوی نەی وتبوو باشە رێ کەوتم. هەڵبەت دوورنەبوو شایەد پازدە بیست هەنگاو

بە پەلە لە دڵدا دیخوێندەوە تا دەهاتم قسەیەک بکەم یان بڵێم دەڕۆم دیسان بەخوێندن درێژی دەدا ئەویش باسی کۆچ نشینی و مەرداری عەشیرەتەکانی بەختیاری،کەمن بەخۆشی تاقەتی بیستنی ئەوانم نیە نەخوازە بە و بۆ حاڵیە ... لە پڕ مێشێک بوو بە فریشتە و دەستی کرد بە ئازاردانی کاکم. ئەویش

لەو لاتر چوومە بن دارەکە و لە سە جەدوەلی خیابانەکەی کە سێبەرێکی خۆشی بوودانیشتم. وتم ئۆخەی ئەوە من بووم تاق کەوتمەوە. رەنگە پێنج یان شەش دەقیقە بەو حاڵەمامەوە هێشتا لە دووی خەتێک دەگەڕام بیرەکانمی لە سەر دابین کەم، هەراهەرایێک سەرنجی راکێشام. لە نێو

دارەکان لای چەپی منەوە
پیاوێکی قەمچی بە دەست،
دەستی منالێکی گرتووە قەمچی
لێ راستکردۆتەوە تەمایەتی
لێی داتلە پەسا جنێوی پێ
دەدات. لە وروەوە کەعادەتی
بل قاسمی شم لە گەڵە
نەم توانی خۆم گێل کەم لێ
گەرێم ئەو پیاوە مل قەویە
زەعیف کوژی بکات ومناڵی،

بێچارە قڕ کات. خۆم پێ
نەگیرا هەستام بە گورجی
چوومە پێشەوە بە توورەیی
کوتم: ئەوە بۆ لەو منداڵە
دەدەی بەریدە بزانم. کابرا
دی من بەم توند و تیژی یە
هاتووم رەنگە ئاوقەی* بەم
منداڵەکەی بەردا. وتی
برا تۆنازانی ئەمە چ
بەدرەسەنیکە سەد جارم

پێ وتوە تفەنگی بادی
مەهێنە ناو ئەم پارکەوە.
لەم گوێچکەی رۆدەچێ
لەوی ترەوە دەر دەچێ.
وتم خۆ ئێستە هیچی پێ
نیە. وتی برا هەرئێستە
چاوی بە من دەوت
تفەنگەکەی دابە دەست
ڕەفیقەکەیەوە. ئەو هەڵات
ئەمیش خۆی دابەدەستمەوە
بۆ ئەوەی شوێنی ئەوەی
ترنەکەوم، کاکە هەرچی
چرا لەو پارکەدا هەیە
بەدەست ئەمانەوە کون
بوەیان شکاوە. جا من
قەرە ولێ ئەم پارکەم
گشتی بە من دەبڕێرن
وتم ئەمجارە بی بەخشە
تا جارێکی تر دێتەوە....
لام کردەوە بگەرێمەوە سەر
جێگەی خۆم، دیم کاکم هەڵ
ستابوو روو بە رووم دەهات
هەر لە دورەوە وتی:
چی بوە؟ وتم: هیچ. هەر
من روو لە جێگەی تەنیاییم
دەرۆیشتم وکاکەم دەهاتە
بەرەوە ئەیگوت جا چۆن
هیچ، کابراش پشتی هەڵ
کردبوو لە گەڵ منداڵەکە
دەرۆیی. بەدەم پرسیارو
پژوارەوە* کاکم هات ولە
لام دانیشت. ناچار جوابی
پرسیارەکەیم داوە کە لە
گەڵ کابرا چیم وتوە و
چیم بیستووە. دوای ئەمانە
کاکم گوشارەیکەی کردەوە
باسی کامپیوتێری

دامەزراندەوە. هەر بەو
گەرمییەی هەوەڵ جارتووکی
سەرم لێ ببوو بەبارە
گوێنی. برسیەتی و
توونیەتی و مەیلی جگەرە
دەستیان دا دەس یەکتر
و ئیختیاریان لێ بڕی
بووم. تەماشای سەعاتم
کردیەک، بیست کەم بوو..
لە پڕهەستامە پا دووهە
ناسەی توندم هەڵ کێشاو
نەختێ چاوم لێک نا.
کاکم هەر ئەوجێگایانەکە
پێی وابوو پێویست بە
دووپاتە کردنەوەیە بە
دەنگی بەرز دەیخوێندەوە.
وردە وردە بەر چاوم
تاریک دەبوو، سەرم لە
گێژەوە دەهات. کەوتمە
رێگە و وتم کاکە با
برۆینەوە بۆ ماڵ برسیمە
توونیمە، بێ تاقەتم، وەختە
شێت بم زۆریشم گەرمایە.
کاکم هەستا پا وتی
راست دەکەی منیش برسیمە
با برۆینەوە. بەڵام ئەو
حاڵەتانە هی خاڵی بوونی
گیرفانە. من وەختێ بێ
پوول بم وام لێ بە سەر
دێت. لەقان لەقان رووڵە
ماڵەوە رێ کەوتین. ئیتر
تاق نەکەوتمەوە هەتا
دەس پێکردنی ئەم وتارە
هەرچەن لە نووسینی ئەم
بەشە ئاخریەدا کاکم و
باوکم خەریکی قسە کردنن.

... زانایانی بەناو بانگی کورد ...

# ئیبنی ئەسیر

محەممەد سەعید ئیبراهیمی

زانای پایەبەرزی ئێران "دێهخودا" دەڵێ:

**ئیبنی ئەسیر** کونیەی سێ برایە کە شارەزای ئەدەب ومێژوو و حەدیس و سەرف ونەحو و عەقاید و فەلسەفە وزانستەکانی دیکەی ئیسلامین.

برای گەورەیان **مەجدەدین موبارەک ئیبنی ئەبی لکەرەم موحەممەد بنی موحەممەد جەزەری** خەڵکی **جەزیرەی ئیبنی عومەرە** و هەر لەوێ لەلای مامۆستا زاناکان درێژەی بەخوێندن داوە تا رادەیەک کە لە جیهانی عیلم و زانستدا بە ئەستێرەی پرشنگداری ئاسمانی فەرهەنگی ئیسلامی ناسراوە.

ئەم زانایە پاشان بووە بە مونشی ئەمیر **موجاهیدەدینی قایماز** و لە دواییدا چووەتە مووسڵ و ماوەیەک لەلای **مەسعوود بنی مەودوود** دەستەڵاتداری مووسڵ ماوەتەوە. پاشان چووەتە خزمەت**نوورەدین ئەرسەلان، شا** و دوایەش بە هۆی نەخۆشی ئیختیار بووە و خانەنشین بووە و زانایان بۆ دیتنی چوونە ماڵەکەی.

میوانخانە وخانەقایەکی لە دێیەکی مووسڵ ساز کردووە و تەواوی ماڵ و مڵکی خۆی بەم میوانخانە و خانەقایە داوە.

موبارەک لە جەزیرەی ئیبنی عومەر ساڵی ٥٤٤ کۆچی لەدایک بووە وساڵی ٦٠٦ کۆچی کردووە.

هیندێک لەئاسەوارەکەی بریتین لە:

- **جامع الاصول** لە دە بەرگی گەورەدا.
- **النهایەفی غریب الحدیث** لە پێنج بەرگدا.
- **الانصاف** لە عیلمو تەفسیری قورئاندا.
- **المصطفی والمختار.**
- **کتاب فی صنعە الکتابە.**
- **البداع.**

لە مێژووی ئیبنی خەلەکان و **الاعلام زرکلی** چەند کتێبی دیکەش بەناوی ئەوەوە نووسراون وەک:

- **المرصع.**
- **منال الطالب**
- **تجدیداسماءالصحابە.**
- **الرسل** و...

برای نێوەنجی **عێزەدین ئەبولحەسەن عەلی** لەساڵی ٥٥٥ لە جەزیرەی ئیبنی عومەر لە دایک بووە ولە مووسڵ وشام وبەغدا لە لای بلێمەتانی ئەوسەردەمە زانستی ئیسلامیخوێندووە و لەپاشان لە مووسڵ بنەگر بووە ودەستی کردووە بە نووسینی کتێبکەگرنگترین نووسراوەی لە مێژوودا بە ناوی **الکامل فی التاریخ** لە سی وسێ بەرگدایە و بە **الکامل ابن اثیر** بەناوبانگە. ئەم کتێبە باسی مێژوویی دونیا لە رۆژی هەوەڵەوە تاسەردەمی خۆی یانی ٦٢٨ کۆچی مانگی دەکا.

ئیبنی ئەسیر خۆی لە

سەردەمی دەستەڵاتداری مەغوولدا بووە وهەوەڵێن مێژوونووسە کە رووداوی تاڵ و شەڕوشووری دەورەی مەغوولی لەکتێبی "**الکامل**"دا نووسیوە وسەرنجێکی تایبەتی پێداوە. هەر بەم بۆنەوە کتێبی گۆڕین سەرچاوەیەکی گرینگی مێژوویە وزوربەی مێژوونووسانی بەناوبانگ لەو کتێبە کەلکیان وەرگر- تووە. کتێبەکانی تری بریتین لە:

- **اسدالغابەفی معرفە الصحابە** لەپێنج بەرگدا کە شەرحی ژیانی ٥٧٠٠ کەسە
- **تاریخ الدولەالاتا - بکیە**
- **الجامع الکبیرفی علم البیان.**
- **اللباب فی تهذیب الانساب.**
- **الجهاد.**

لەساڵی ٦٣٠ کۆچی دوایی کردووە و هەر لە مووسڵ نێژراوە.

برای بچووک **نەسروڵڵا ئەبولفەتح زیائەدینە** کە بە ئیبنی ئەسیری کاتب بەناوبانگە ولە زانستی ئیسلامیدا شارەزا بووە و بە منداڵی قورئانی لەبەر کردووە.

ساڵی ٥٨٨ ی کۆچی لە جەزیرەی ئیبنی عومەر لە ٢٠ی شەعباندا لەدایک بووە. لە مووسڵ دەرسی خوێندووە و چووەتە لای **مەلیک ولئەفزەل** کوڕی **سەلاحەدینی ئەیووبی** لە دیمشق وبۆتە وەزیر کار و باری خەڵکی پێ سپێراوە. لەهەموو بارێکەوە باوەڕێکی پتەویان پێی بووە. پاش ماوەیەک سیاسەتی ئەفزەلی پێ باش نەبووە وبەجێی هێشتووە و چووەتە لای **مەلیک زاهیری** دەسەڵاتداری حەلەب .لەویش زۆر نەماوەتەوە و چووە بۆمووسڵ وئاخری لە بەغدا وەفاتی کردووە

وەکی مێژوو نووس دەنووسن کەزەینێکی باشی بووە ودیوانی **ابی تمام** و **متنبی و سحتبری** لەبەر بووە. ئاسەوارەکانی بریتین لە:

- **المثل السائر فی ادب الکاتب والشاعر** لە دوو بەرگدا.
- **کفایەالطالب فی نقد کلام الشاعروالکاتب.**
- **المفتاح المنشالحد- یقەالانشاء**
- **المعانی المخترعە فی صناعەالانشاء.**
- **الوشی المرقوم فی حل المنظوم.**
- **الجامع الکبیر.**
- **البرهان فی علم البیان.**
- **رسائل**

کە بە رەسایلی ئیبنی ئەسیر بەناوبانگە.

**جەزیرەی ئیبنی عومەر**

شارێکە لەرۆژاوای چۆمی دەجلە وپردێک لە زەمانی ساسانیان لەو شارە لەسەر دەجلە لێدراوە کەشوێنەواری هەر ماوە.

مێژوونووسان نووسیویانە کە بەردی بناخەی ئەو شارە لە لایەن **حەسەنی ئیبنی عومەر** لە تایفەی **بنی سەعلەب** لەساڵی ٢٥٠ی کۆچی دانراوە ولەسەدەی چوارەمدا زۆر قەوغا بووە.

حاسڵی ئەم شارە بریتییە لە: هەنگوین ،کەرە، فندق گوێزو... کەبۆ مووسڵیان ناردووە.

**ئیبنی بطوطە** ئەمشارەی بەوێرانی دیوە وتەیمووری مەغوول وێرانتری کردووە پاشان حکوومەتی **جەزیرەی ئیبنی عومەر** وەدەست (**عەزیزان**)ی کوڕی کەوت و دوایە بەدەست سوڵتان سەلیم گیرا.

ئەوشارە بەشێک لەخاکی **تورکیایە** و زمانی کوردی زمانی خەڵکی ئەوی یە.

**سەرچاوەکان:**


-**دایرەالمعارف اسلامی**
-**الاعلام مجلد ٥ صفحە** ٢٧٢.
-**ابن خلکان جلد٢ صفحە** ١٥٨.
-**فرهنگ دهخدا.**
-**معجم البلدان جلد ٧ ٨** صفحە ٢٢٨.

گەنجێ منی دووره ،ئۆسما ن لاو دووره ، غەریبۆ
لاو دووره ،
ژ ڤردا حەیا کۆک مەیدانێ باژارێ شامێ
دووره ،
ل پێ گەنج ئۆسمانێ من گرتی عەسکەر و
تا بۆوره ،*
ل کێلەکا ئۆسمانێ من کرکرا شووره ،
د ستیدا قەیتا ن قەفەز و حەریره
ل چەلەکا دەشتا سروجێ مال دانیبوون ،
عەیشا بەتێ، ئێما گرجۆ ،فاتا رەسۆلە ،

سەرەکا گییا خەجا خدره ، دەڕێ* ب
کەسەرێد
کوور* و هووره .

* * * *

دایێ ! شەڤا پاییزێ درێژه ،خەوام نایێ،
ئەزێ بالا خوه ددمێ
بەندا پیۆر* و مێژینێ ،
ل ئالییێ قولبەڤا هلتێ.....

* * * *

ئەرێ کێ ل ناڤبەرا دوو دلان گۆتنەکە
چێ بکێ ،

بلا ببه رێبەرێ حەشتی حەزار حەجاجێن موسلمانان ،
بەرقێ خوە بدە بەر قولبە
دەستێ خوە باڤێ قولپا کەعبە وبێتێ ،
و ل رۆژا حەشەر و مەحشەرێ ،
گاڤا داتینن تەراز و مێزینێ ،
بلا خوەدێ مەزن،حەزرەتێ محەمەدب وەکیلێ وی بێ ،
بلا دبن سەنجاقا کەسک دا
ب دەستێ خوە کلیتێ جەنەتێ ڤەکێ
* * * *
دایێ دلێ م دینە
ژ کولا ب کولە ،
ژ برینا ب برینە ،
دەردێ ئەشقێ گرانە ،
دەردکی بێ دەرمانە.
خوەدێیۆ تو ب سەرێ توکەسی قە نەهیینێ ،
کی لناڤبەرا دوو دلان گۆتنەکە نەچێ بکێ ،
و هەردوو دلان ژ هەڤ ب دوور خینێ
بلا برووسکا ئەسمانا ،قورشینا حەفت درامی ل بنێ چێنگ خینێ ،
بلا برینا خوە کوور بێ ،
کولا خوە خەدار بێ ،
سبێ حەیا ئێڤارێ دەست لبەر ناڤێ بێ.
ڤێرین و هۆلینا خوەر بەر ئەسمان بێ،
ئێخکرنا ئێخکری خوین بێ ،
بلا عیلاج ودەرمانێ برینا وی قوۆچێ هێشترا شیرێ چووکان بێ ،
ئەوژی قە ناتێنە دینە،
بلا پەرچێد دل وکەزەبێ د دێڤ را بوەشنە
حەفت سالا دمالا باڤێ خوەدا نێن و ئارقێن قە نەبینێ ،
بلا نان ب کێرگێ بێ،ئەو ب تاژی بێ ،
پارا قە نەگیهنهێ ،
خوە نەدێ بەردارێ بێشکا دەرگووشا قە

نەبێ :
نەنی ، نەنێ ، نەنی......،
میزا زارۆکێد نێر ومێ ژ دایێ قە نەبینێ ،
لاو، لاو، لاو گەنجێ من لاو.....
خوەدێیۆ، ئەلاهۆ،بلا مەزنێد خوە ل مەزەل بن ،
بچووکێد خوە فەخ لسەر بن ،
خۆرتێد خوە چاڤ پەهن بن ،
پیرێد خوە رووڕەش بن ،
نان ب زهێربێ، دەو ب قەهوە بێ ،
بلا ل دەڤێ گەلی ، نەوالا
خورت وسەرسەری ب کەچێد وان شا بن.
زک تژی بن، حەمێز ڤالا بن ،
لاو ،لاو، لاو، گەنجێ من لاو.....،
دە هەرە غەریبۆ، لاو، لاو.....
دایێ دیسا بلا بێ ،
ل وەلاتێ غەریبێ ،
بەر ئێرکانا بایێ غەربێ دگەڕێ ،
لێ ،لێ ، لێ ،لێ....
* * * *
گەنجێ منی دوورە ،لاو، لاو، لاو ،
لاو ئۆسمانۆ وەرە دبەر مالا باڤێ من را هەرە،
ب گاڤکێ دودیا نێزیکە ،
شوورێ خوە ل پیکە ،مەرتالێ خوە راکە،
داکەڤ ناڤ بازارێ رهایێ ل مەحکەما.
محەمەدعەلی پاشاب دینێ کورمانجیێ ، ب شەریعەتا محەمەدیێ
ل باڤێ منی تەرەس ودیویس گلی کە،
سێ جاران پێچیێن خوە پێڤەدە ،
سینگ وبەرێ من عەڤدالێ لسەر جانێ خوە تاپێ کە،
سینگ وبەرێ من مەتالێ دبوو کابلک پەنیرێ کۆچەر،
بلا ب تەرا نەبێ حەسرەت ،کول وکەسەرە وەرە ژ خوەرا بکە تاشتێ وفراڤین ،،

بخوه و هەڕە.

* * + * *

مەحروومیٚ دلیٚ منیٚ دینە،
بەژنا دریٚژ بخەملینە ،
رابە ستییٚ خوە بشکیٚنینە، کەلا خوە
برڕژینە ،
زەندیٚ کالی گەور ڤەمالینە ،
ژمن ڕا نانکیٚ دودیا ل سیٚلیٚ خینە.
جەنگا کۆرمۆسقۆف پر شیٚنە
کول وکەسەرا قە مەکشینە .

دایێ ! نە وەختا دەڤیٚ خوە بدیٚ
وەلاتیٚ غوربەتیٚ ،
دایێ ! پڕنە ژ تاو تا کەچیٚد خەلکیٚ،
هەگەر چاڤیٚد خوە بەردی بەژنا تاکیٚ ،
ول من ڤەنەگەریٚ و نەییٚ ،
بەلکی دەستیٚ خوە باڤیٚ بەری وجیٚبیٚ ،
بدەرخینیٚ بەنیکیٚ مۆرک ومرجانا ، بینا
من متالیٚ، عەڤدالیٚ،ژیٚ دتیٚ یە

* * * *

دایێ ! دلیٚ من دینە .

چووندن ب دەست مرۆڤە .
هاتن ب دەست خوەدیٚ یە.
بەلکی ئەز سەری خوە بدەم ترباتاری
دیاریٚ رەحمەتیٚ
ژ ویٚ وبشووندا تو من قە نەبینە ،
دە رابە ب هەڤال و هۆگریٚد من را
برڕیٚخینە ،
لاو، لاو، غەریبیٚ وەلاتا، لاو ، لاو....

* * * *

دایێ نەما دلیٚ من دبیٚ .
خوەدیٚیۆ ئەزیٚ بالا خوە ددمیٚ
دیسا غەریبیٚ وەلاتا ، ریٚدووریٚ
من گەنج ئۆسمان لبەر چاڤیٚد من ددیٚ
ریٚ .
دایێ ئەزیٚ دیسا ماچکم زین وزەنگیٚ ،
بەری ریٚکەتنیٚ، ئەزی دەستیٚ خوە باڤیٚم
ستییٚ خوەمتالیٚ، عەڤدالیٚ ،
ڤەکم بەنیکیٚ مۆرک ومرجانا ، بەردم بەریٚ
و جیٚبیٚ .

خوەدیٚیۆ ! بهارا مە بهارک شیرینە.
گولیٚد زەر و سۆر پەقینە ،
کەناریٚد گەلی و چەما خەملاندینە ،
کولیکیٚد سۆر و زەر لهەڤ شدینە ،
خەلکیٚ منی فۆول وبووکین ب ئیٚش و ب
برینە
نە جارکی بالا خوە ددیٚ ل ئالییٚ
ژیٚرینە ،
رابوویە دیراککی تۆ زیٚ،نزانیٚ ڤانا
ریٚوینە ،
سیواران هەسپ راکرنە جرید و بەزینە ،
ماڤانا کینە، نەکینە ؟
دایێ ! نەدیسا دبیٚن چووندنا جەنگا
کۆر مۆسقۆف پرچەتنە ،
دبیٚ شینگ شینگا دارا رمیٚ ئەگیدا
مڕەمڕە کۆریٚن داییکا وباڤکان
پڕ کوشینە
دایێ ! نزانم ئیٚ مرییە مرینە، ئیٚ ب
برین برینە،

ئێ ساخ وسەلیم شووندا ل مال وخودانا
قەگەرینە ،
ئەز نزانم ل سەرێ من دایـــە دەردێ
ئەشقێ ، کولەلا خەداروبێ دەرمانە
چاڤێد من کۆر بوونە، زێ ودەرا قـــە
نابینن ،
لاو، لاو، لاو گەنجێ من، لاو، لاو....
* * * *
گەنجێ منی دوورە،
گەنجێ من ئەز ب قوربان دە وەرە،
ئەزێ دەستێ خوە ڤەگرم لبەر خوەدایـــێ
مەزن،بەلکی بارێ کەتیا راکێ،
بەلکی گەنج ئۆسمانێ من ساخ وسەلیـــم
ل من ڤەگەرینێ ،
دایێ ! باڤێ منێ بەخیلە، پیسە، رەزیلە
دایێ ! نەترسا من ئەوە سۆزوقرارا من
نەبێ ،
گەنج ئۆسمانێ من ل من ڤەنەگەرێ ،
وە ئەشق و مەراق دهوندرێ زکێ مـــن دا
ببن
کولا لەکلەکێ ئێد بمینن
ئەزێ ب دەنگکی بانگکم،ببێم: ئوسمـــان
لاو، لاو،
دایێ ! ئەبال وزێنا خوە ددمێ ،
سێ سیوار سیوار بوونە ژ دەشتا مـــەو
ژێرینە ،
سەوی سەد یێ ئۆرتێ سیوارێ من گەنـــج
ئۆسمانە ،
ئەزێ ببێم: گەنجێ من مەکە ومەلەزینە،
خوەدێێۆ! دیسا دوزگین ولیوانێ ب سـەر
من دا بـقولبینە ،
م ستیشکایێ ،م گەردەن خەلایێ، م بـــە-
تارژایێ،م خولێوەندایێ، وەرە
ب چەپلێ* من رەبەنێ بگر وچەکە تەرگـا
مەسهینە ،
دناڤ گوندێ مەیی فەسادوقومسادرا مـــن
ببە و برەڤینە ،

ئەمێ بەرڤێ خوە بدن ئالییێ بیرەجکـــێ
بیرەجکا خاپانە ،
گەنجێ من ! گەر خەلاسییا مە ل وور ،
نەبوو، ئەمێ خوە
بەردن ناڤ سێسد وشێست وشەش بێسکـــێ
تەڤ زێرینە ،
ئۆسمان ! گەر خەلاسییا مەل وور نەبـوو
ئەمێ بەرڤێ خوە
بدن ئالییێ جۆمێ، جۆمیا کورمێنجە ،
جەم باڤێ بۆزین ،خوەدییێ کەلا باسۆتـێ
لبەر ئاڤا عەفرینە .
قوربان ! گەر خەلاسییا مەل وور نەبوو
ئەمێ
هەرن ناڤ تاتێن ڤالچە* پەهن، کوم سۆر
وکوم سپیا
ل بازارێ حەلەبێ ،
گەر خەلاسییا مە ل وور نەبوو ئەمـــێ
دەڤێ
خوە بدن ئالییێ دروزێ ،
دەرباسکن حەماە و حمسێ ،
دوزگین ولیوانا لێخە ل دەڤێ دیلی مە-
سهینەێ
ب دوورکەڤن ،ئەمانەت نابێ ب مروڤـــێ
زەمینە ،
جیران نکانە هەرێ مالا جیرینە .
عەرد فاسقە، خەلق پیسن، ومالاندا روو-
نشتینە ،
دبێن : دلێ ڤایی کەتییە کەچا ڤاییە
ئۆسمان ا قوربانێ ژ مەرا نەماوەرە
دەستێ خوە ب من دە
ئەمێ خوە بەردن کۆک بازارێ شامێ
ل تاخا* سالحییێ ،
ئەمێ سێ جاران بێژیێن خوە پیڤەدن و
خوە
ڤەیدکن ل عەسکرێد دل چاپینە .

# مەنگوڕ ١

دوکتۆر جەوادی قازی

تەحقیقی

نووسەری ئەم ووتارە میرزا محەممەدی جەوادی قازی یە یا دوکتۆر جەوادی قازی . ئەم وتارەش یەکێکە لەو وتارانەی بە ئەڵمانی نووسیویەتی و لە ساڵی ١٩١٠دا لەگۆڤارێکی ئەڵمانیدا بڵاوی کردۆتەوە . داخەکەم تا ئێستا کەمکەس بایەخی بە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە داوە و لەسەر ژیانیشی هیچ کەسێک شتێکی ئەوتۆی نەنووسیوە . من هەندێ لەنووسینەکانیمچنگ کەوتووە بەتەماشم دەربارەی ژیانی شتێک بنووسم . هیوادارم ئەو برایانەی هەر بەرهەمێک لە بەرهەمەکانی ئەویان لا دەست دەکەوێ یا دەربارەی ژیانی شتێک دەزانن بۆم رەوانە کەن یاخۆیان بڵاوی بکەنەوە . وەکوو وەفا ویاد کردنەوەی ئەو کەسەی لە تۆمارکردنی "تحفه مظفریه" و چەندین بەرهەمی بایەخدار لەگەڵ ئۆسکارماندا رەنجێکی زۆری کێشاوە وئەو دەسنووس وچیرۆکانەی لە فەوتان رزگار کردووە . بە ئەڵمانی وفارسیش کۆمەڵێک نووسینی بەنرخی بۆ بەجێ هێشتووین .زیندووکردنەوەی بەرهەمەکانی د. جەوادی قازی ئەرکی هەموو مرۆڤێکی دڵسۆزە ، چونکە کەلێنی گەورەمان بۆپڕ دەکاتەوە .

ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی نایابە دەربارەی وەزعی گەلی کورد لەکۆتایی سەدەی ١٩ وسەرەتای سەدەی ٢٠ و بەرپەرچدانەوەی بیرو رای هەندێ نووسەری ئەڵمانە .

ئەمەنامە ی دوکتۆرا ـ کەیەتی کە ساڵی ١٩١٧ لە یاساداپلەی دوکتۆرای پێ وەرگرتووە .

ئەم رۆژانە لە کتێبخانەی دەوڵەتی(٣) لە بەرلین بەشی رۆژهەڵات "رسالة ضبط عشایر ساکنان اطراف ساوجبلاغ مکری"م پێ گەیشت ،١٦٠ لاپەرەیە . ساڵی ١٩٠٣ بەفارسی نووسیویەتی. هێشتا بڵاو نەکراوەتەوە باسی عەشایری مەنگوڕومامش و دێبۆکری و،گەورگ وپیران دەکا ..

**هۆزی کوردی مەنگوڕ :**

لەناو هۆزەکوردەکانی ئێران و تورکیادا ، هۆزی مەنگوڕ لەناو هەموویاندا جێگای بایەخ پێدانێکی گەورەیە . لای ئەوانەش کە بەئیتنۆلۆگیاوە خەریکن چونکە ئەو هۆزە بە چاکی سروشت وخوو رەوشتی خۆی پاراستووە ، هەرچەند ئەمە سەدان ساڵە کەوتۆتە بن دەسەڵاتی بێگانەوە ولەژێر کارتێکردنیشیان بووە . مەنگوڕ ئازاترین هۆزە . بۆ ئێران وتورکیا شئەمراستیە دەرکەوتووە ، هەروەها لە کوردستانیشدا ، بە تەواوی دانی پێدا دەنرێ ." ئازای وەکوو مەنگوڕ" ئەم ووتەیە بڵاوەو هەموو کەسێکیش شانازی پێوە دەکا .

مەنگوڕەکان ، لەشڕو لاریان قایم وپتەوە ، بەهێز وبەتواناشن . رەنگیشیان لە کوردەکانی دراوسێیان سپی ترە ،ئەوانەی لە خوارو ژووری ئەواندا دەژین ، کە رەنگێکی ئەسمەریان هەیە ئیدی هیچ جیاوازی یەکی ئەوتۆیان لەگەڵ کوردێکی نموونەیی نیە . جێگای نشتەجێ بوونیان راستەوخۆ لە باشووری سابڵاخەوەدەست پێ دەکا کەچەقی مەڵبەندی موکری یەکانە ،شۆڕ دەبنەوە تا دەگاتە زەنجیرەی شاخی

وەزنێ ، کە زەنجیرەیەکی بەرزە وبەدرێژایی سالێش بەفری پێوەیە. لە رۆژئاوا ـ شەوە لەگەڵ هۆزی مامەش هاوسنوورن ،کەئەو ناوچەیە شانۆی شەڕە. سنووری نێوان ئێران و تورکیایە. مەنگوڕەکان بەدیالێکتێکی کوردی دەدوێن ، کەلەشێوەی موکری یەوە زۆر نیزیکە لەسەرزاریش رەوانە و ئاوازێکی خۆشی هەیە و بە چاکیش خۆی لەکارتێکردنی زمانی تورکی و عەرەبی پاراستووە .هەندێ وشەیان هەیە ،ئاوازەکەی لەئەرمەنی دەچێ ، هەر لەسەر ئەم بناغەیەشە ، ئەرمەنیەکان مەنگوڕەکان بە خزمی خۆ دادەنێن گوایە لە زمانی کۆندا مەنگوڕەکان بەرزایی یەکانی ئەرمنییان بەجێ هێشتووە .لەم شوێنانەی ئێستایان سەقامگیر بوون . ئەم قسەیە خەیاڵ پلاوە و ناتوانرێ بە هیچ کلوجێک بسەلمێنرێ .بەڵام مەنگوڕە ـ کان خۆیان لەو بڕوایە دان کە بە رەگەز دەچنەوە سەر رۆستەم کە فیردەوسی لە شانامەکەی باسی کردووە . ئەمەش هەر جۆرێکە لە ئەفسانە .

پێش نزیکەی ٧٠ سالێک مەنگوڕەکان تەنیا یەک هۆز بوون وتەنیا یەک کادەرویش ( سەرەک هۆز ) سەرکردایەتی دەکردن ،ئەویش باپیرئاغا بوو. ئەمە (٢١)کوڕی هەبوو هەر لە سەردەمی ژیانی خۆیدا ئەو گوندانەی لەژێر دەسەلاتیا بوو بەسەر کوڕەکانیا دابەشی کردن . ئەمڕۆش مەنگوڕ بەسەر (٢١ ) تیرەدا دابەشکراوە. هەر تیرەیەکیش کادەروێشی یەک سەرکردایەتی دەکا .ئەوەی سەرۆکی هەموو هۆزەکە دەستی بەسەر هەر (٢١) کادەروێشی یەکەدا دەڕوا ، ناونیشانی مەزنی پێ دەبڕێ .حکوومەتی ئێران باج وسەرانەی خۆی تەنیا لەو (٢١) کادەروێشی یە وەردەگرێ ،ئیدی هیچ کاری بەسەر ئەوەوە نەداوە کێ هەژارە و کێ دەوڵەمەندە ، دەبێ هەموویان پارەیەکی دیاری کراو رەوانە بکەن .

هەر لەزەمانەی بنەماڵەی سەفەوی یەکانەوە مەنگوڕەکان کەم گیر و گرفتیان بۆ حکوومەتی ئێران نەناوەتەوە. بەهێزی چەک نەیان توانی سەربەم هۆزە دانەوێنن ، چونکە زۆر لاواز بوون ، بۆیە ویستیان بەفێڵ وتەڵەکەبازی بە ئامانجەکانی خۆیان بگەن . بۆئەوەی بەچاکیش لەم شێوازە بەکارهێنراوە تێ بگەین من حەز دەکەم مێژووی ئەم هۆزە لەسالانی سەدەی نۆزدەهەمدا بگێڕمەوە

لەسەرەتای سەدەی ١٩ دا ئەحمەددخان لە عەشیرەتی موقەددەم (مقدم) بوو، کە عەشیرەتێکی تورکە ، بەناوی حکوومەتی ئێرانەوە باوکی باپیرئاغای بۆ زەماوەند دەعوەت کرد. ئەویش بەخۆی وخزم و کەس وکاروسوارەکا ـ نیەوە بۆمەراغە ( نیزیکی دەریاچەی ورمێ یە ) هاتن .

سەرەک هۆزی مەنگوڕ لە کاتی دیاری کراودا گەیشتە جێ ،لەگەڵ نێزیکەی ( ٢٠٠) سوارێکدا ئەوانیش بە شێوەیەکی زۆر گەرم بە ئاهەنگەوە پێشوازی یان لێ کردن و لەناوکۆمەڵەماڵێکی خۆیاندا جێگا و رێگایان بۆ ساز کردن .

کەشەوداهات مەنگوڕەکان لەهەموو لایەکەوە پەلامار دران،سەرەک هۆز وبەشێکی زۆر لە هاوەڵەکانی دەست بەجێ کوژران . تەنیا چەند کەسێک توانیان لەو قەسابخانە خوێناوی یەخۆیان دەرباز بکەن و دەنگ و باسەکە بگەیننە ماڵەوە . مەنگوڕەکان لەوتوانایەدا نەبوون ئەو دەمە تۆڵەی کوژراوەکانیان بکەنەوە ، هەرچەند ئەمەش ئاواتی گەورەیان بوو .ئیدی هەمزە ئاغای کوڕی باپیرئاغا ئەوەی لێ رادەبینرا تۆڵەی خوێنی باپیرە گەورەی بکاتەوە. ئەو دەستی بە

پیوەندی بەستن بە شێخ عبیداڵڵەی بەناوبانگەوە کرد ولەپلانەکەیدا هیرش کردنەسەر رژیمی ئێرانی بە گرنگترین شت دەزانی . لە ساڵی ١٨٨٠ دا شان بەشانی کورەکەی شێخ عبیداڵڵە ،، عەبدولقادر (ئێستا ئەندامی ئەنجوومەنی پیرانە لە ئەستەمبووڵ) شەریان دژی رژیمی ئێران بەرپا کرد ئامانجی هەردووکیان ئەوە بوو ئێران داگیر بکەن و سەید عەبدولقادر ببێتە شای ئێران . بە شێوەیەکی درندانەی بێ وێنە ، مەنگو- رەکان دایان بەسەر هەریمی ئازەربایجاندا ، هەرچییان وەگیر کەوت تالانیان کرد و هەر کەسێکیشیان وەبەر دەست کەوت کوشتیان . لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ، میاندووئاوو بناویان کەوتە دەست وهۆزە تورکەکانی ئەو ناوەیان پەرتەوازە کرد. ئەمە تۆڵەیەکی درەنگی بێ بەزەیی یانەبوو رژیمی ئێران رووبەرووی هەستانەوەیەک بوو کە لەو پەشێوی یەی ئەفغانستان دەچوو لە سەردەمی سەفەوی یەکاندا .ناسرەددین شا ،بەزووترین کات هەرچی هێزی بۆ دەخرایەگەر، بۆ قەڵاچۆکردنی کوردەکانی بەرێ کرد . بەڵام ئەمە نەبووە هۆی ئەوەی ئێرانی- یەکان رزگاربن ، بەڵکوو ئەو پەشێوی یەی لە بەرەی کوردەکاندا سەری هەڵدابوو بەهۆی تێک شکانی کوردەکان هەمزەئاغا ناچار بوو بۆ شاخەکان بکشێتەوە .

بەبێ ئەوەی نەخشەکانی خۆی جێ بەجێ بکا . پاش تێپەربوونی ساڵێک ، ئەمیر نیزامی گەرووسی حاکمی سابلاخ ،کەپێشتر نوێنەری ئێران بوو لە پاریس و هەندێ پایتەختی تری ئورووپا ، بەدووی سەرۆک هۆزی مەنگوردا رایسپارد بۆ ئەوەی پەیمانی ئاشتی لەگەڵیا ببەستێ. حاکمی سابلاخ بە قورئان سوێندی بۆخوارد ، کە موویەک لە پێستی هەمزەئاغا نابێ خوار ببێتەوە ،تا ئەو رۆژەی ئەمیرنیزام بەسەر رووی زەمینەوە دەبێ وتا گیان لە جەستەیدا دەبێ وبەسەر سنگی خۆیدا دەکێشێ ( بە بۆچوونی رۆژهەڵاتانە ئەمە جێگای گیانە ) بەڵام ئەمیر نیزام بۆئەوەی سوێندەکەی نەکەوێ چولەکەیەکی لەبن پاڵتۆکەی قایم کردبوو پاش ئەوەی هەمزەئاغا هیور بووە ،ئەویش لەلای خۆیەوە سوێندی بۆخوارد ، کەئاشتی بپارێزێ ،ئەمیر نیزام ئەو چۆلەکەیەی کوشت کەسوێندی درۆی پێ خواردبوو .بریار- یشی دەرکرد هێرشی بکرێتە سەر رەشماڵی سەرەک هۆز و هاوەڵەکانی و هەموویان لە ناو بەرن ،هەرواش بوو. سەری هەمزەئاغایان بەدیاری بۆ شارەوانەی تاران کرد بەڵام لە کوردستاندا بیرەوەری ئەم پاڵەوانە هەر زیندووە . ئەم چارەنووسە جەرگ برەش لە لایەن زۆر گۆرانی بێژەوە کراوەتە گۆرانی ."بەیتی هەمزە ئاغا" مووچرکەیەکی قایم بەدڵی هەموو کوردێکدا دەهێنێ. ئەمرو بایز ئاغا سەرەک هۆزی هەموو مەنگورە لەشەرە سنووری نێوان ئێران وتورکیادا ، بە لای تورکەکاندا دایشکاند و ناونیشانی پاشای وەرگرت .

مەنگورەکان تا رۆژی ئەمرو بەکۆچەری ماونەتەوە و بەبەردەوامیش لە چوار چێوەی سنووری ناوچەکەیاندا گەرمێن وکوێستان دەکەن .

زستانان لە گوندەکاندا بەسەر دەبەن. کە بریتین لە کۆمەڵە کۆختێکی تارێک وپێک ،لەهاوینیشدا لەو تاوڵانەدا دەژین کە لەنێوان ئەو کێوانەی لووتکەکانیان بەفر دایپۆشیوە ،هەڵدراون . هەر لەویش لەورگای پان و پاراویان بۆمەروماڵاتەکا- نیان دەست دەکەوێ.

دریژەی هەیە

# کێلە شین

ع . سەعدی

" شۆڵتس" کۆنینە ناسی مەشهووری ئەلمانی بۆ یادگاری پێشینیان و ناساندنی شوێنەواری ئەوان بریاری گەڕان و پشکنینی شاخ و کێوو دۆڵی وڵاتە دوورەکانی دا .

" شۆڵتس " لەبەشێکی "ئاشووری" وشێوەخەتتەکەشی میخی یە .

ئەو بەردە لە٨١٤ی پێش میلاد بەفەرمانی"تیشوونی " پادشای " ئورارتۆ" (١) لەو شوێنە رۆنراوە . لایەکی

کێل بەمانای بەردێکی داتاشراوی لێک ولووس کراوە کەلە سەرینگەی دەیچەقێنن و چونکە رەنگی ئەم بەردە مێژوویی یە شینباوە (کێلە شین)ی پێ دەڵێن .

وێرای سپاس لە: سمکۆ ئەیوبیان کە وێنەی کێلەشینی بۆ ناردووین

لەسەر یالی ئەوکێوە کە شنۆ و رەواندز لەیەک جیادەکاتەوە تەختە بەردێک بە قیتی چەقماوە کە بەرزایی یەکەی یەک میتر و یازدە سانت ،پانایی یەکەی حەفتا سانت وئەستوورایی-یەکەشی سی وسێ سانتی میترە (١) وکەوتۆتە سەر خەتی سنووری ئێران وعێراق. ناوی ئەو بەردەکێلەشینە .

هەر لەنزیکی ئەوێ لەخاکی ئێراندا کێوێک هەیە بە نێوی کێلەشین بە بڵیندایی ٢١٨٠ میتر کە ناوی بەردە شینباوەکەی بەسەردابڕاوە .

ئەم تەختە بەردە هەر دوو دیوی نووسراوی لەسەر هەڵکەنراوە دیوێکی بە زمانی " ئۆرارتوویی " یە و دیوەکەی تریشی بە زمانی

بەردەکە نزا و پارانەوەیە لە " خێو"ی شاری"خالدی" (٣)، و دیوەکەی تری باسی رووداوێکی جەنگی دەگێڕ— ێتەوە

گێڕانەوەی هەندێک رووداوی سەیر کە لە توێژینەوەی کێلەشین‌دا رووی داوە جگە لەوە کە سەرنج راکێشە زۆر شتی تریشمان بۆ روون دەکاتەوە کەیەکێک لەوانە دەرخستنی وەدەستهێنانی رووحی کاروکۆشش و ماندوو بوونی زانایان وپسپۆرانی دەرەوەیە .

لەمێژ ساڵ بوو ئەم بەردە بە پاڵی کێلەشینەوە راوەستابوو وکەس نەیدەزانی رۆژێک ناوبانگی بەجیهان دا بڵاو دەبێتەوە .

سەفەرەکەیدا تووشی ئەم کێلە هات و بۆ هەوەڵ جار ناوی وی بەگوێی خەڵکی دنیا گەیاند. ئەمجار کەوتە توێژینەوەوقالب هەڵگرتنەوە بەلاّم بەر لەوەی بتوانێ بەرهەمی کار و تێکۆشانی خۆی وەکوو راپۆرتێکی زانستی بلاّو کاتەوە هەرلەو مەڵبەندە کوژرا وشتەکانی بەتالاّن چوو ! هەرچی لەسەر مێژووی ئەم بەردەش وەدەستی کەوتبوو لەگەڵ شتەکانی تێداچوو .

ساڵ بە دوای ساڵدا دەهات و دەرۆیشت، ئەمکێلە هەروا کڕو بێ دەنگ وێستاو لەمەترسی سوان و لەنێو چووندا بوو، تاکوو پاش ماوەیەکی زۆر "ژێنڕاڵ راولینسۆن" (۴) موحدقیقی بەناوبانگی بیستوون دوای چەند جار سەفەر بۆ ئێران تووشی ئەم کێلە هات ودوای نووسینەوەی دەقی نووسراوی بەردەکە، بەرهەمی کاری خۆی نایە بەردەستی زانایان و پسپۆڕانی ئەم عیلمە .

لە ساڵی ۱۶۵۲ کۆنینەناسێکی تر بەناوی"خانیکۆف (۵) توانی قالبێکی تری لێ هەڵگرێتەوە .

تائێرە سەرکەوتنێکی زۆر وەدەست کەوتبوو و کەم و زۆر ناسرابوو. و لەم بەینەدا ئەوەی زۆر جێگای ئومێدەواری بوو قالبگیری ـ یەکی " خانیکۆف " بوو کە واوێدەچوو بە هۆی ئەم قالبەوە شەقڵی سەر ئەو رازە بشکێ و ئاشکرا بێ . بەلاّم سەیر ئەوەیە کەقالبی دووهەمیش بە دەردی پێشوو چوو و فەوتا !

لە ساڵی ۱۸۵۸ "بلاّو" کۆلێکسیۆنێکی لە چەند لەتکی ئەم کێلە پێک هێنا کە لە هات و چۆدا ئەو کۆلێکسیۆنەش نەما ! .

لە ۱۸۵۸ەوە تا ۱۸۹۰ بە ماوەی سی ودوو ساڵ کەس

۱) میرزا سیدجعفرخانی مهندس باشی(مشیر الدولە)لە ریسالەی"تحقیقات سرحدیە"دادەلێ : "کێلەشین بەردێکی یەکپارچەی شەش پاڵوویە بەبلّندایی نزیکەی دوو زەرعو ئەستوورایی سێ چارەک کەلەسەر ئەم بەردە بەردێکی شەش پاڵوویتر قایم کراوە و لەدوندی کێوی نێوان (سیاه کوه وگردنە پشت خرینە ) بەتایبەتی چەقێنراوە .

۲) بەروایەتێکی تر لە ۸۲۵ی پێش زایین بەفەرمانی "منواش" .

۳) خالدی(= هاڵدیە ،هاڵدیا )هەندێک لە توێژەرانی نوێ رایان وایە کە وشەی" کورد "هەمان"خالدی"یە و گۆڕاوە . لەسەدەی نۆهەمی پێش زایین لە مەڵبەندی "وان " دەوڵەتێک پێک هات بە ناوی هاڵدیا (=خالدیە ) کەئاشوورییەکان "ئورارتۆ" و "ئوراشطو"یان پێ دەگوت وبە عیبریش "ارارط"یان ناو دەبرد .یۆنانیەـکانیش بە **"الارودی" و"خالدوی" و"خالدایوی"**یان دەناسی . ئەم دەوڵەتە تاکو سەدەی شەشی پێش زایین **بەردەوام** بوو . دوای ئەوەی کەهەرمەنیەکان پەیدا بوون خالدیەکان بلاّوبونەوە ولە کوێستانەکان خزان (کوروپدی، گزنفون ،بەرگی سێهەم ،بەشی ۳-۱ ) .

لەباکوری گۆلی "وان (شوێنەواری ئەم قەومە بەجێ ماوە ولەنزیکی" طرابوزان )یش لە سەردەمی دەوڵەتی بیزانس دا شوێنێک بە ناوی"خالدیا "بوە کەشاری"خلاط (اخلاط) هەرلە ناوی ئەوشارە هاتوە . تەنانەت لەلای قەفقازیش ناوی ئەم قەومە ماوە ویەکێک لەخێڵەکانی کەڵوری کرماشانیش ئیستا خالدی ناوە ( کردوپیوستگی نژادی وتاریخی او. رشیدیاسمی ) .

۴) سرهانری راولینسون (۱۸۱۰-۱۸۹۵از ) رۆژهەلاّتناس وباستانشناسی انگلیسی کەبەتایبەت لە ئاشوور ناسی دا بەناوبانگە .

۵)خانیکۆف (۱۸۲۲ -۱۸۷۸از ) لەرۆژهەلاّتناسانی سۆڤیەت کە لەساڵی ۱۸۵۷ تاکو ۱۸۵۹ بەماوەی دووساڵ بۆبازدیدوتحقیق هاتە ئێران .یەکێک لەشوێنەوارەکانی وی "وصف مملکت بخارا "یە .

۶) ژاک ماری دمۆڕگان (۱۸۵۷-۱۹۲۴از موهەندیسی مەعدەن وباستانشناسی فەرانسە ،بۆ ماوەیەکی زور سەروکی کوری دوزینەوە وباستانشناسی فەرانسەوییەکان بووە لەئێران ومیسر (اسنل حمورابی ) بەهۆی ئەو دیتراوە وبەری کرابو موزەی "لوور " گرنگترین شوێنەوارەکانی ئەمانەن : "ازشوش تالوور تمدنهای نخستین " ."بشرماقبل تاریخ "ورسالەدرسکەشناسی ایران " "مشرق زمین درماقبل تاریخ "

۷) متعدی تعمیرات موزە مردمشنایی نزکادرو

۸)

۹)رەشیدی یاسەمی (۱۲۷۴ -۱۳۲۸ ھ) نووسەر وەرگێر شاعیروماموّستای کورد کەبەزمانەکانی انگلیسی فەرانسە ،عەرەبی ،وپەهلەوی شارەزایی بوو. دوو نموونە لە شوێنەوارەکانی ئەوانەن :"ترجمەآلبرمالە دیوانیشیعر " .

تخونی ئەم بەردە نەبوو بەلام تازە ناوی هاتبووە سەر زاران وئاخری مەردێکی تر پەیدا دەبوو کە بێتە مەیدانەوە .تاکوو"دێمۆرگان" (۶) کۆنینەناسی مەشهووری فەرانسەوی بڕیاری دا ئەو لەتکە بەردە بداتە پال مێژوو وبەمجۆرە بپارێزرێ

تا ئەو زەمانە هێشتا قالب گیری یەکی تەواو لە کێلەشین پێک نەهاتبوو ، پاییزی ۱۸۹۰"دێمۆرگان"هاتە ئازەربایجان ، لەوێوە لەگەل بەلەدێک کەهەلبەت پارێزەری گیانیشی بوو (۱) روویان کردە کێلەشین . کە گەیشتنێ سەبارەت بە نائەمین بوونی مەلبەندەکە ماوەی دوو سەعات نوسخە ـ بەرداری کرد و بەرەو نیشتمانی خۆی گەڕاوە .

لە داهاتوودا "هاهربرت" (۷) لەسەر داوای شەخسی دێمۆرگان لە رووی **(ئیستا میاژەکانی)** ئەم کێلە قالب گیری کرد و بەو جۆرە بۆ هەوەلین جار قالبێکی ساغ و تەواو لەم کێلە پێک هات .

دەقی تەواوی نووسراوەکە لە لایەن "مۆرگان"ەوە درا بە پرشیل "ئاشوورناسی بەناوبانگ . هەروەها وەرگێراوەی ئەم بەردە نووسەش لە گۆوارێکی فەرانسەویدا چاپکرا . نووسراوی سەر بەردەکە لە ۴۲ دێڕ پێک هاتووە و بەشێکی ئاوا دەلێ :

" لە لایەن"مهرکپووسی " و" ئیشپۆنین منوای کوڕی " کە هەر کەسێک پادشای ولاتی توشیا بوونە پێشکەش بە هالدیە خاوەندی شاری مۆزازیراکرا ."

هێشتا مەعلووم نەبووە کە شاری توشیا لەکوێ بووە. نووسراوەکانی سەرئەمبەردە سپاس و ستایشی پادشاهانی " هالدیە"یە کە بۆسلامەتی مندالرووەدەکەنە دەرگای خاوەندی مۆزازیروقوربانی بۆ دەکەن .پاشان داب و رەسم ونەریتی ئایینی خۆیان بەجێ دێنن وبۆ راگەیاندنی نزا و پارانەوەی خۆیان بە خاوەندی شاری مۆزازیر ئەم کێلە لەسەر یالی کێو دەچەقێنن .

ئەوە بوو کورتەمێژووی ئەو کێلە کە سی (۳۰) هەنگاو لە سنووری عێراق دوورە و یادگاری سێ هەزار سال لەمەوبەرە و کێلەشینی پێ دەلێن .

خوالێخوشبوو " رەشید یاسەمی" (۹) لە تاریخەکەی خۆیدا بەناوی"کردوپیوستگی نژادی وتاریخی او" لە بارەی ئەم کێلەوە ئاوا دەدوێ :

" پاشی ئەوەی کەشۆرشە ـ کانی ناوخۆی ئاشوور دوایی بە پادشایەتی شەلمەنسەر هێنا ، خەلکی مەنبەندی زاگرۆس لە ژێر رکێف هاتنەدەر و لە سەر پێی خۆیان راوەستان ، جگە لە مەلبەندەکانی"پارسوا " لە رۆژئاوای گۆلی ورمێ کە نەیتوانی سەربەخۆیی بە دەست بێنێ چونکەدەولەتێکی نوێ بەناوی "هالدیا"خالدی لە لای ئەرمەنستان پەیدا بوو و دەستی بە سەر ئەم ناوچەیە داگرت .

پادشای خالدی بەردێکی داتاشی و لەسەریالی کێلە شین (جنووبی رۆژ ئاوای گۆلی ورمێ ،نیزیک سنوور) چەقاندی کە ئێستاش ماوە .

---

**سەرچاوەکان :**


۱ ـ جغرافیای غرب ایران ژاک دمورگان ـ ترجمەکاظم ودیعی ـ تبریز ـ۱۳۳۹ .

۲ ـ کردوپیوستگی نژادی وتاریخی او . رشیدیاسمی .

۳ ـ رساله تحقیقات سرحدیه ـ میرزا سیدجعفرخان مهندس باشی ، ملقب به مشیرالدوله ـ بەاهتمام محمد مشیری ـ بنیاد فرهنگ ایران ازسری منابع تاریخی و جغرافیای ایران شماره ۲۴ ـ شماره ۷۷ .

۴ ـ فهرست بناهای تاریخی واماکن باستانی ایران

۵ ـ روزنامەکیهان شماره ۶۹۷۶ دوازهم آبانماه ۱۳۴۵

**رەنگی مەر**

**١ـ قەرقاش (سپی) :** بەومەڕە قەرقاش دەگۆترێ کەتەواوی لەشی سپی بێ وبرێک لە لووتودەم وچاو ولاقی رەش بێ .

**٢ـ رەش (قەر) :** بەومەڕە دەگوترێ کە تەواوی لەشی رەش بێ .

**٣ـ کەو :** ئەومەڕەیە کەرەنگەکەی کەو وشینە .

**٤ـ سوور ( سۆر ) :** ئەومەڕەیە کەرەنگەکەی سووربێ .

**٥ـ بەلەک :** ئەومەڕەیە کەپێستی بەلەکە مەری بەلەک سێ جورە : رەش (قەر) بەلەک ، سووربەلەک کەوبەلەک (شین بەلەک )

**٦ـ تەبەش :** ئەومەڕەیە کەتەواوی لەشی سپی بی ودەم وچاووگویی رەش بی . جارێ وایە کە خەتیکی سپی بەنیۆچاواندا هاتووە .

**٧ـ سوورتەبەش :** ئەو مەڕەش وەک مەڕی تەبەشە ، بەلام لەجیاتی رەش رەنگی دەموچاو وگویی سوورە .

**٨ـ رسەر :** بەومەڕە دەگوترێ کەتەواوێ دەم وچاووسەروگوی وبرێکیش لەئەستوی قاوەیی یا خۆلەمیشی بێ .

**٩ـ قۆتشان :** مەڕیکی سپی یە کەخال یانیشانێکی رەش یاسوور یاشین لەسەرتەوقی سەریەتی .

**١٠ـ سەرسوور :** ئەومەڕەیە کە سەرودەمو چاووگویچکەی تەواو سووربێ .

**١١ـ سەرکەو** (سەرشین) : بەومەرە دەگوترێ کەدەم وچاووسەری کەویاشین بێ، بەوجورە مەڕانە "کەویسەر"یش دەلێن .

**١٢ـ سیس :** ئەومەرەیە کەتەواوی لەشی و دەم وچاوی سپی ومژۆلی ئال یازەرد یاسپی بێ .

**١٣- بەش** : بەومەرە دەلین کەتەواوی لەشی رەش ، سووریاکەوبێ وتەنیا نێوچاوانی سپی بێ. مەری بەش سێ جوورە :رەش بەش، سوور بەش کەوبەش (شین بەش) .

**١۴- تالە**ئەومەڕەیەکە دەموچاووگوێی و سەری قاوەیییاسوورە . لەهیندیک جی بەومەڕە "سەرقمەر"یش دەلێن، ئەومەڕە وەک بزنی همبز دەچێ.

**١٥- چاوسوور** : ئەومەڕەیە کەتەواوی لەشی سپی بێ ودەوروبەری چاوەکەی سووربێ .

**١۶- چاورەش** :ئەومەڕەیە کەدەوروبەری چاوی رەش ولەشی سپی بێ .

**١٧- چاوشین** (چاوکەو) : مەریکەکەتەواوی لەشی سپی یە ، تەنیا دەوروبەری چاوی شینە .

**١٨- شین (هشن)** : مەریکە کەلەشی سپی یە دەم وچاوی خال خالی شینی لییە وەک بزنی پوش دەچی . ئەومەڕەش سی جوورە : شینی چاورەش ،شینی چاوسوور ،شینی چاوقمەر .

**١٩- ویس** : مەڕیکی سپی یەسەری شینی کراوەیە .

**٢٠- غەمر** : مەڕیکە کەسەری قاوەیی یە .

**٢١- تەو** :مەریکە کەسەرودەم وچاوی خال خالی سوور ورەش وشین تێکەلاوە .

**٢٢- ئوستوگولی**(بەرگولینگ) مەڕیکە کە یەک یادوو مەنگوو لەیاگولینگی گوشتی لەئەستۆی دایەزوریش جوانە وەک ملوانکە دەچێ.

**٢٣- ناومل گۆل**: مەڕیکی سپی یە کەلەسەر شانی تەقالێکی رەش ، سووریا شین هەیە .

**٢۴- رسەرشین** : مەڕیکی سپی یە سەری تائەستۆی شینە .

**٢٥- سەرڕەش** :مەڕیکی سپی یە کەدەموچاوو ئەستوی رەشە .

**٢۶- کەژ : مەریکەکەسەرودەموچاوی**سووریان سووری کراوە وزەردە

**چونەتی گویی مەڕ:**

**١- کەڕ** (کەڕە) : ئەومەڕەیە کەگوێی زور، چووک بێ وپێوەی دیارنەبێ.

**٢- کوڕ**: مەڕیکە کە گوێی کورتە وەکوو بادام دەچێ، بۆیە لەبریک ناوچاندا بەو جوورە مەڕە "گوی بادام"یش دەلێن.

**٣- بەل** (گوی قامچی) مەڕیکە کە گوێی درێژە وهەردووللای گوێی وادیارە کەپێکەوە لکاون وەکوو خیارچەنبەر دەچێ مەڕی بەل لەرووی رەنگیشە وەدابەش دەکرێ، وەک :بەلە بۆز، بەلەسوور، بەلەبەش و .....

**۴- گوی کەوچی**(گوی کەوچک) : مەڕیکە کە گوێی وەک کەوچکی دارینە ، زوربەی مەڕەکان گوی یان وان .

**٥- حەمدان** (هەرکی) : گوی ئەومەڕە زۆر، درێژوپانە ،چون زوربەی هۆزی هەرکی ئەوجورە مەڕانە بەخێو دەکەن، بۆیە بەوجورەمەڕەمەڕی هەرکیش دەبێژن . مەڕی هەرکی یاحەمدان دەبێ زستانان لەجێی گەرم واتە ئاران وگەر - میانان‌دا بەخێو بکرێ . چون گوی زۆردرێژە لەکاتی ئاو خواردنەوەدا گوی دەکەوێتە نێو ئاو . جائەگەر ئاو زۆر ساردبێ وهەواش هەروا ئەو مەڕە بەهۆی گوی یەوە تووشی سەرمادەبی ودەمرێ .

**چۆنەتی خوری مەڕ:**

مەڕ لەباری چۆنەتی خوری یەکەش دابەش دەکرێ، وەک : مەڕی شەنگ ،بسکین، رووتەنگ یارووتەلەو ....

**١- شەنگ** : مەڕیکە کەخوری یەکەی درێژو جوانە ، بەومەڕە مەڕی " کەژ"یش دەلین .

**٢- بسکین** . ئەومەڕەیە کەخوری یەکەی هەم زورە وهەمیش درێژە .

**٣- رووتەلە** :مەڕیکەکەخوری یەکەیزۆرکەم وکورتە ، لەدوورەوە وادەنوێنێ کەخوری پێوە نیە . بەومەڕە "رووتەنگ" ، " رووتەلە"و "رووتەک"یش دەلێن .

**۴- هرک** ( پورک ) : مەڕیکە کەهێندێک خوری وەک قژلەسەرسەریەتی کە " پۆپن "

پێـدەلێن،زوریش جـوانـە .

لەکوردی ژووروو بەخوری، **"هری"**بەبەرگنیش **"لوا "**یا **"لبا "** دەبێـژن .

**رەنگی بـزن**

**١- رەش** : بزنێکە کەتەواوی لەشی رەشـە بەوجورەبزنانە "گوردەرەش"یش دەلێـن.

**٢- سـوور** : تەواوی لەشی سوورە .

**٣- کەوەر** (کەور) : تەواوی لەشی سپی یە .

**٤- شیـن** : تەواوی لەشی شینـە

**٥- بەلەک** : بزنێکە کەپێستی بەلەکە

بەلەکیش سێ جوورە : رەش بەلەک ، سووربەلەک شیـن بەلەک .

**٦- چـوور** : بزنێکە کەلەشی سـووری کـەم رەنگە

**٧- موور** :بزنی کەرەنگەکەی سووری خەنەیی بێ لەکوردستانی ژووروودا "موور"ی پێدەلێـن بەلام لەکوردستانی خواروودا "موور"بەبزنێک دەلین کە گویچکەی کورت بێ وەک مەری کور .

**٨- قـەشا ن** (چال) بزنێکە کەنێوچاوانـی سپـی یـە .

**٩- حـەمس** (همبز ،مس): بزنێکە کە رەنـگی گوی وبرێک لەسەرودەم وچاوی دەگەل دەورو‌بەری کلک ولاقی تائەژنۆسوور یا قاوەیی بێ .

**١٠- پـۆش**: بزنێکە کەدەم وچاووگویی خال خالی شیـن وبـۆزە .

**١١- بەلەبۆز** : ئەوبزنەیە کەگوی بـاریک و رەنگی بۆزە . مەری بەلەبۆزیش هەیە .

**چـۆنەتـی گویی بز ن**

**١- کـر** : بزنیکە کەگویی زۆر کورتـە

**٢- مووچ(موور)** :بزنێکە کـەگویی بریسک، لەگویی بزنی کر گەورەترودریژترەوەک گویـی مـەری کـور .

**٣- بـەل** : بزنێکە کەگوی گەورەیـــە وەک مـەری بەل وگوی کـەوچی .

**٤- حـەمدا ن** : بزنێکە کەگوی زۆرگـەورەو پان ودریژە وەک مەری هـەرکـی .

**چۆنەتی شاخی مەرو بز ن :**

پەزیا مەری نێر زۆربەیان شاخ یا "ئسترۆ" ـ یان هەیە . بەپێچەوانە مەری مێ یـا مـی زوربەیان بێ شاخن . بەمەری شاخدار دەلـێـن **"کەل"**مەری بێ شاخیش **" کۆل"**ە .

مەری چوارشاخیش هەیە ولەنێو هـەرمیگـەل وکەری یەک داچەند مەری چـوارشـاخیش بـەر چاودەکـەوی .

مەری کەشاخەکەی زۆر کورت وچکولـەبـێ مەری **" دەندە "**پێـدەلێن .

مەرێک کەشاخەکەی پێچاوپێچ بێ وســەری شاخەکەی وک ئالقەبێ، مەری**"شاخ گوستیـــل"** واتە شاخ ئەنگوستیلەی پێدەلێن .

بزنیش شاخ وبێ شاخی هەیە ،بەبزنی بێ شاخ **"کۆچ"** دەلین ئەگەرشاخی بزن راست وبلینـدو شووش بن، پێدەلین بـزنی**"قـولووچ"** ئـەگـەر شاخەکەی بۆپشتەوە خواربێ بزنی**"شاخ کودەل "** یا **"پێلە"**ی پێدەلـێن .

**مـووی بـز ن :**

بزن لەباری چۆنەتی موویە وەدووجـــورە :

**بزنـی موو ، بزنـی مەرەز .**

بزنی موو بزنیکە کەتەواوی لەشی مـوویـە ولەژێر مووش دا وردە کولکەی زۆرنەرمونۆلی هـەیە کەبە **" کووروو "** یا **" تفـتـیک "** بـە نـاووبانگـە .

**بزنی مەرەز** بزنێکە کەتەواوی مووی لەشی نەرمە وەک کووروو دەچێ ئەوبزنە بـە **بـزنـی ئەنقەرە** ( ئانکارا ) بەناووبانگە .

لە تاریک و روونی بەربەیاندا ئەوکاتەی کە خەو لە هەمیشە شیرین وزولاڵ ترەو ئادەمیزاد نایەوێ بە هیچ جۆرێک لەوکاتەدا دەس لە خەو هەڵگرێ وتەنانەت ئەگەر بە زۆریش وەخەبەری بێنن دەیەوێ دیسان بگەڕێتەوە ناو جێگا و بانەکەی وکەمێکی تریش بخەوێ ، دەنگێکی بە سام ڕای پەڕاندم . " هەستە ماڵ کاول ! هەستە تاکەی خۆت مات دەکەی ! ؟ خەڵکی گەڕەک هەموویان لە ماڵ چوونەتە دەرەوە ! هەر تۆی بێ خەیاڵ وبێ فکر لەجێگادا ماوی ! "

بۆ لەحزەیەک وام لێک داوە کە بێ گومان بوومەلەرزە و سووتمان رووی داوە! ئەگینا لەو بەربەیانەدا خەڵکی گەڕەک بۆ ماڵیان بەجێ هێشتووە وچوونە دەرەوە! چاوم هەڵکوشین وبە لاڵەپەتەوە پرسیم "ها ! چی بووە؟ چ قەوماوە ! دیسان فڕۆکە هاتوون بوومەلەرزەیە چی یە ؟..."

ژنەکەم هەر وەک یەکەمجار بۆڵژنی هات :" شێت بووی ! خەونت دیوە ،ئەسپەک لەسەری داوی ؟ بوومەلەرزەی چی ؟ ئەمرۆ هێلکە دەدەن، هێلکە! عالەم بۆ هێلکەی دەرکەوتوون

پشووم هاتەوە بەرخۆ وبە دەم باوێشکەوە گوتم " ماڵە بابت بەقور گیرێ،نیوەعەمرت کردم، لەمن وایە دنیا وێران بووە. هێلکەم ناوێ ، لێم گەرێ کەمێکی تر بخەوم بوخۆت دەزانی شەو تا درەنگانێک نەخەوتووم ؛"

ژن قسەکەمی بڕی و بە دەنگێکی بەرزتر بەسەری دا گوڕاندم"هێلکەت ناوێ ! ئەی ئەم خێزانە بەچی بەڕێ بچێ ؟ هەستە برۆ نێو سەفەوە ! هەڵنەستی بەمەرقەدی شێخ سەتڵێکت ئاوی سارد لە پاڵ دەکەم ! "

وەبیر سەرگوزەشتی سوقڕات حەکیمی یونانی کەوتمەوە کە رۆژێک لە ماڵە خۆی باسی باران بارین و هۆیەکانی بە چەن قوتابی دەگوت لە نەکاو ژنەکەی بەسەری دا قیژاند وسەتڵێکی ئاو بەسەر داکرد. قوتابی ـ یەکان کە سەریان لەو کارە سوڕمابوو لە سوقڕاتیان پرسی "قوربان ئەم ژنەی تۆ بۆ وای کرد؟" سوقڕات لە وەڵامدا گوتی " ژنەکەم وەک هەور وایە ،لەپێشدا دەشریخێنێ وبە دووی شریخەدا دەبارێنێ! "

نازانم ژنەکەی سوقڕات چی لە مێردەکەی ویستبوو .

هەرچی بووبێ گومان ناکەم شەڕی ئەوان لە سەر هێلکە بووبێ! لەترسی ئەوەی بەو بەرەبەیانە ساردە بە دەردی سوقڕات نەچم بەپەلە هەستام خۆم لەبەر کردەوە وبەخەوالوویی یەوە منیش مالّم بەجێ هێشت ورۆیشتم دە سەفی هێلکەوە کە گەڕەکە مالێک درێژ ببۆوە .

ئەو رۆژانە ولاتی ئێمە تووشی شەڕێکی داسەپاوەو دوژمنی خوێنخۆر ەبومبارانی شار و دێهاتە زۆربەی دانیشتوانی سنووری ئاوارە کردووە و زیانێکی زۆری بە ئابووری ولاتەکەمان گەیاندووە لە هەل ومەرجی وادا کەدەبێ هەموو چەشنە ئیمکانێک بۆ دیفاع لە سەربەخۆیی ولات دەکار بێنین و شەڕ هەتا تێکشکانی دوژمن درێژەی ببێ بێ گومان کەمایەسی خۆراک و کالای پێویست دێتە پێشێ وهاو ولاتی دەبێ پشوویان لەسەرەخۆ بێ .کاتێک بیرم لەو مەسەلە دەکردەوە سەرم هەلبری بزانم کێ لەپێش هەموانەوەیە . بەلێ دیسان وەک هەموو جارێک "سەحەرخانم" هەوەلّ کەس بووا تا ئێستا لە سەت سەف دا ڕاوەستابم کەمە .سەفی قەند و شەکر ، گۆشت ، سیغار ، نەوت وحەلەم قەلّەمی دیکە . لە هەموو سەفەێک دا یەکەم کەس هەمیشە سەحەرخانم بووە . ئەم خانمە بەرێزە دراوسیمانە و خۆیەتی وکچێکی هەلترشاوی لەخۆڕازی کەبەکەس ڕازی نابێ وشوو بەکەس ناکا و خەریکە پرچی سپی لە مالّە بابی بهونێتەوە !زۆرجار تێکۆشاوم هەرچۆنێک بێ لە سەفێکدا بکەومە پێش سەحەرخانم بەلاّم تا ئێستا سەرنەکەوتووم! لە درێژایی تەمەنمدا کەسی هێندە وریا وزیت و زرینگم نەدیوە . ئاگای لە هەموو شتێک هەیە . بەتایبەتی ئێستا کە شتوومەک بە کۆپین لەناو شاردا ئەبەشنەوە ، سەحەرخانم ئاگاداری یەکی سەرسوڕهێنەری دەبارەی هەل ومەرجی ئابووری و کۆپین وبابەتی جۆراوجۆر و ئەوشتانەی کەبەکۆپین ئەدرێن بە خەلّک هەیە . چەن رۆژ لەمە ـ وبەر بە بەر مالّیان دا تێ پەر دەبووم ، لە بەر دەرگا ڕاوەستابوو .پاش سلاو و ئەحوالّپرسی پرسیارم کرد :

"سەحەرخانم لەمێژە چمان بە کۆپین وەرنەگرتووە .ئێمە بێ خەبەرین یا جارێ چ نادەن هەر ئەوەندە وام گوت . وەک مەکینەی کامپیوتەر چاوی تێ بڕیم ودەستی پێکرد :

"لەزۆر جێگا شت دەدەن . لە گەڕەکی "قولّەقەبران " دووکانی مامبرایم بەکۆپینی ۲۴۸ برینج دەدەن. لەدووکانی رەسووەموز گەڕەکی " سێ ئاشان" بە کۆپینی ۸۶ مریشک دەدەن. بەکۆپینی ۲۱۱ لە گەڕەکی "سەربەرداش" قەند و شەکر دەبەشنەوە . سەری ۷۵۰ گرام. قەندەکەشیان کلّۆیە و زۆر ڕەقە . بە کۆپینی ژمارە ۷۶ لە گەڕەکی ئەرمەنیان رۆنی نەباتی دەدەن. سەری۴۵۰ گرام. بەشی چ دەکا ؟ دوهێلکە و رۆن ئەوەندەی زیاتر دەوێ! لە گەڕەکی گومرک دووکانی بایزی عەولا ڕەش بە کۆپینی ۱۴۶ سیغاری دەدەن ! عەمرم نەمێنێ پار کۆپینێکی سیغارم سووتا .داوەشێم ئەو رۆژە چووبوومە حەمام هیچ چلّکنیش نەبووم ! لەدووکانی میرزا سەلاحی بەزاز بە دەفتەرچە پارچە دەدەن. دوێنێ لە گەڕەکی خوّمان کەرەیان دەدا . سبەی لە گەڕەکی "مەجبوراوا" نەوت دەدەن ..."

سەرم سوڕمابوو ،چاوم زەق ببوونەوە و هەروا تێی هەلّدەڕوانیم. لە خۆوە پرسیم " ئەی بەکۆپینی ۲۵۶۹۲۶ چی دەدەن !؟"

پێم وابوو پرسیارێکم کردووە کە هیچ جوابی نیە . بەلاّم بە زەردەخەنەیەکەوە وەلاّمی دامەوە :

"ئەم ژمارەیە هی شەڕی دووهەمی جیهانی بوو. وابزانم بەم ژمارەیە لە شاری موونیخ، شەقامی بێتهووین ، دووکانی یورگن ئیشتراوس لە چواری مارسی ۱۹۴۶دا گۆشت بەرازیان دەدا بەخەلّک!"

لەوانە بوو رم بتەقی ومێشکم بلاّو بێ! لێ بڕامزوو

خۆم دەرباز کەم و هەڵێم کەچی سەحەر خانم ڕای گرتم و لە درێژەی قسەکانی‌دا گوتی : "...دەزانی چیە ،مێژووی کۆپین زۆر کۆنە ودەگەڕێتەوە زەمانی یونانی قەدیم !" ئەمجار پێم پێوەنا بەغاردان دوور کەوتمەوە و ئێستا کە ئەم چیرۆکە دەنووسم بۆم روون بۆتەوە کە ژنەکەی سوقراتیش بووەرگرتنی هێلکە ئاوی بەسەر مێردەکەی دا ڕشتووە !

نزیکەی مانگێک لە دابەشینەوەی هێلکە تێپەڕیبوو. چەن ڕۆژێک بوو لەسەر یەک چرای شار دەکوژانەوە وکارەبا هەڵ دەبڕا .تاریکی وشەوەزەنگ باڵی بەسەر وڵات دەکێشا ، بەخچاڵ وفریزەر دەکوژانەوە وخەڵکی گەرەک شەوانە بە شەم وچرای نەوتی ماڵیان ڕووناک دەکرد.

لەو ڕۆژانەدا بوو کە بەیانی پاشنان وچا خواردن لە کۆڵانی ئێمەدا بۆ بەهەرا وقریوە وزەنا زەنا. لە ماڵ دەرپەڕیم تا بزانم چ باسە و چ قەوماوە. دیسان "سەحەر خانم"ا دەبێ چ رووی دابێ ؟ بۆ دەگری ودەبارێنێ ؟ ئەم حەشامەتەی بۆ لە خۆی کۆ کردۆتەوە. نەکا خوای نەخواستە کۆپینێکی سووتابێ‌و مەسەلەن نەیزانیبێ سێ ڕۆژ لەمەوبەر لە گەڕەکی "مەیدانی حەیوانان" بە فلان کۆپین شتیان داوە و ئەو نەچووە شتەکە وەرگرێ! وردە وردە ، چوومە خزمەتی گوتم :

" بەڵا دوورە ،سەحەرخانم چ قەوماوە؟ بۆچ وا دەکەی ؟

بە دەم گریانەوە وگوتی :

"جا دەتەویست چ بقەومێ کاک هەمەوەندا ئەی قوڕبە سەرم! ئەی ماڵ وێران خۆم ! ئەی خاکەسەرخۆم! قازەکەم ڕوا ئەم بێ کارەبایی یە ، ئەم خامۆشی یە ماڵی وێران کردم. هەرچی گۆشتی لە فریزەردا بومان بۆگەن بووە. گۆشت بە دەرەک. قازەکە ! قازە قەڵەوەکە !"

ساڵێک لەمەوبەر ڕاوکەرێکی خزمی چەن قازی کوشتبوو ویەکیشی بۆ سەحەر خانم ناردبوو. باشم لەبیرە کە قازەکەیان هێنا لە مالیان دانیشتبووومو باسی ڕووداوەکانی وڵاتمان دەکرد. بە وەژوور کەوتنی قاز قسەمان گۆڕا وکەوتینە سەر ئەو باسە کە گۆشت قاز چۆن خۆشە وچەن چەشنە خۆراکی لێ ساز دەکرێ. زۆرم ئیشتیا پەڕی بۆ سەر ئەو گۆشت قازە وبە ڕوودا ماڵاوی یەوە داوام لە سەحەر خانم کرد یان کوتێکم لە سینگ ورانی بداتێ یان کە خۆراکی لێ ساز کرد بانگم بکا. لە بیرم نەچوتەوە کە فەرمووی :

" بەو زوانە نای خۆم. خۆت دەزانی گۆشت بە زەحمەت دەس دەکەوێ. جارێ لە فریزەردا هەڵی دەگرم و هەر کاتێ لێمان نا بەشی تۆش دەنێرم."

**درێژەی هەیە**

# ئەهوەن

ح.سوبحانی

" ئەهـــوەن"

. لە کوردستان و لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا ، سەدان شاعیر و نووسەر وئەدیبی پایە بەرز هەڵکەوتوون کە نەیانهێشتووە وەجاخی ئەدەبیاتی کوردی بەرە و کوێر بوونەوە بڕوا ، هەر کامەیان بە شێوەیەک و هونەرێک پەرەیان بە ئەدەبیاتی کوردی داوە و باخچەی ئەدەبیاتی کوردی یان بە گوڵی هەزار رەنگ و بۆنخۆش رازاندۆتەوە ، یەک لەو شاعیرانەی کە لە مەڵبەندی سنەی هونەر پەروەردا هەڵکەوتووە ، مامۆستا (ئەهوەن) ە کە نیزیکەی سی ساڵە شیعر دەڵێ ، بەڵام سەدمخابن تا ئێستاوە کوو زۆربەی شاعیران و نووسەران وئەدیبانی کورد نەناسراوە.

. (ئەهوەن) ناوی موحەممەد ئینسافجوو ، کوڕی عەلی کەرەمی دەباغ ، کوڕی عەبدولڕەحمانی خەیات ، کوڕی عەبدولڕەحیم کوڕی قادر عەودەی خەڵکی گوندی ڕەزاوی هەورامانە. نیزیکەی دوو سەدوپەنجا ساڵ لەمەو بەر بنەماڵەیان لە گەڵ دەرەبەگەکانی هەورامان دا تێک چووە وماڵ و حاڵی خۆیان لە ئاوایی ڕەزاو بەجێ هێشتووە و هاتوونەتە شاری سنە و لێرە دا نیشتەجێ بوون .

. (ئەهوەن) ساڵی ١٣٠٥ی هەتاوی لە شاری سنەدا هاتۆتە دنیاوە . هەر بە منداڵی نێرراوەتە بەر خوێندن و دەستی بە خوێندنەوە و فێربوونی قوڕئانی پیرۆز کردووە ، کە لەخوێندنەوەی قوڕئان بووەتەوە لە قوتابخانەی سەرەتاییدا تا پۆلی چوارەمی خوێندوە ، لەم کاتەدا باوکی کۆچی دوایی دەکا و موحەممەدیش بۆ ژیاندنی خێزانی بە ناچار واز لە خوێندن دێنێ و دەس بە ئیش و کار دەکا. کرێرەودری و رەنج و زەحمەت دەبێ بە سەر چاوە ئیلهام بۆ موحەممەد و هێدی هێدی هەستی دەبزوێنێ و دەس دەکا بە دانانی شیعر. لە بەرا شیعرەکانی بۆ هاوڕێ یان و هاوکارانی دەخوێندەوە و لە گەڵ دنەدانی ئەوانەدا زیاتر هەستی بۆ شیعر گوتنێ دەجۆشا .

ژیانی ناخۆش و تاڵی خەڵک و نەبوونی دوکتۆر و دەرمان و نەخۆشینە جۆراجۆرەکان کە تووشی خەڵک دێن زۆر کاری تێ دەکا وئەم شیعر دادەنێ کە بە شێوەی سنەیی یە .

وەسیەت بێ بۆتان دووای مردنم
بەر لە شۆردن و کەفەن کردنم
تکام لێتان هەس بێژنە مردگ شۆر
سەرە وخوارم کا لەبان تاتەشۆر
زووخاو فراوان لە دڵما جەمە
برژگێتە خوارە و فرەس یا کەمە
زووخاو هەتیمی ، زووخاو بێکەسە
دووربوون لە خوێندن دەرس و مەدرەسە
نەسەر پەرەستێ ، نە پشتیوانێ
شاگرد ئەم و ئەو بۆ تێکەی نانێ
جەمێ ئاو گۆشت بووسەد جەم نان وماس

...بێ کۆت و کراس
...ەتی بێ کەوش
...یا من نەبووم بەم حالەزارە
...ەیان وابوون خەڵکی ئەم شارە
...خۆشخانە نە دەوا و دوکتۆر
...یمەی کەچەڵ بوو لە کەنیشک و کوڕ
...نجە و هەوڵە، دریلە و خەرکان
...رەی لێ ئەکوشت لە منالەکان
...مە مەینەتی منالیمان بوو
...رووخا و خواردنی دەسالیمان بوو

...ئەهوەن لە ساڵی ١٣٣٩ ی هەتاوی تا ساڵی
...١ لە گەڵ رادیۆ سنە هاوکاری کردووە و
...رەکانی بۆ ناردوون و لەسەر رادیۆ
...نراوەتەوە . هەروەها ئەو شیعرانەی کە
...وی گۆرانی بووە، بە هونەرمەندانی
...نگ خۆش دراوە و ئەوانیش بە دەنگ
...تتوویانە .

...( ئەهوەن) لە گەڵ شاعیرانی هاوچەرخی
...ۆیدا، تا بۆی لواوە پێوەندی گرتووە، بۆ
...ەوەی لە گەڵ خۆیان و بیروڕایان ئاشنا
...ێ .

کاتێ کە ماموستای نەمر ( هێمنی)
خۆشەویست لە ساڵی ١٣٦٤ داسەرێکی شاری

سنەی دا ئەم شیعرەی پێشکەش کرد:

ئاورت بەرداوە دڵ لەم هاتنە
دۆستەکانت شاد و ناحەز دوژمنە
خۆشەویستی! جێت لە دڵ پیاو وژنە
شۆڕشێکت خستووە، شاری سنە
شارەکەت تێک دا و ئەڵێن پێت هێمنە!

لە وەڵامی ئەم شیعرەدا ماموستا( هێمن) ی ڕەحمەتی سپاسی کرد و فەرمووی ئەگەر شارەکەم تێکدابێ بەرەو رزگاری گەلمان داون .

ماموستا ئەهوەن لە گەڵ زاراوە و بن لەهجەکانی زمانی کوردی دا ئاشنایە و بە زۆربەیان شعری داناوە . هەروەها شیعری بە زمانی فارسیش هۆنیوەتەوە . کە بۆ وێنە چەن نموونەیەکی ئەخەینە پێش چاوی خوێنەرانی بەڕێز :

ماچ* ان کە وەهار وەش* ەن دڵگەشەن
بەڵێ راس ماچان وات* ەشان وەشەن
(هەورامی)

زمسان وەسەر چی یا* یگە وە بەهار
دڵم خوازێگەی چم* ەی ناو گوڵزار
(گەرووسی )

فەرق نیە وە لام بەهار و پاییز
غەمگین سەرشێوا و ج* ەدووری ئازیز
(گۆران )

وەی لاشەی زەبوون چۆر بەت قوتیاسەی
ئەوشێ جەرم دان ئاوم چنیاسەی
(لۆری )

پشتم کۆم بووگە ئێژی دار پەردم
وەک سپۆن هارێ نگ کوتبا گەم وردم*
(سنەیی )

عمری بگذرد بە آه و حسرت
کدا مین بهار ، کدا مین حسرت
( فارسی )

ئەهوەن پیم وایە لە وەرزی بەهار
بە تەنیا هەر تۆی پەشیو و خەمبار
( سۆرانی)

تکا لەخوێنەرانی بەڕێزی سروە دەکەین ئەم خاڵانەی خواروو لەبەرچاو بگرن :

١- نووسراوەکان بە خەتێکی خۆش بنووسن وابێ بۆ خوێندنەوەی تووشی گیروگرفت نەبین .

٢- لە دیوێکی کاغەز بنووسن .

٣- ناونیشانی خۆتان تەواو بنووسن تا وەڵامی نامەکانتان بە ،دەست بگاتەوە .

٤- ئەگەر بابەتی وەرگەڕاوتان بۆ دەنێرن، ئەسڵەکەشی بۆ بەراورد و هەڵسەنگاندن بۆ ئەم ناوەندە، بنێرن .

٥- ئەگەر دەگونجێ نووسراوەکان لە دوو یا سێ لاپەڕەی گۆوارەکە پتر نەبێ بۆئەوە جێگە بۆهەموو بابەتێک ئاوالە بێ .

٦- دەستەی نووسەرانی سروە وەک گۆوارێکی فەرهەنگی- ئەدەبی دەتوانن لەباری ڕێنووس ورێزمانەوە دەست لە نووسراوەکان وەربدا .

٧- ئەو بابەتانەی بۆ ئێمەی دەنێرن لەبایەگانی-دا هەڵدەگیرێ و ناگەڕێتەوە بەخاوەنی .تکایە نوسخەیەک لای خۆتان رابگرن .

دەستەی نووسەرای سروە

**مەهاباد:** کاک مەحموودسۆفی میرزا

برای بەرێز چاک و خراپی داب وشوێن لە رووی کردەوە و بەرهەمێکی کە هەیەتی دیاری دەکا . ئێمە ناتوانین بڵێین ئەو کارە، ئەو رەسمە چاکە یا خراپە. مەگەر خراپ بوونەکەی وەک ژن بەژنە وشتی وا بۆ ئێمە روون بووبێتەوە. بەلام ئەگەر لە گوندەکاندا کور لە لای باوک سیغار ناکێشێ ومنداڵی خۆی راناموسێ وماچ ناکا و بووک بە ئەدەب دێت ودەچێ و بە پارێزەوە لەگەڵ مێردومنداڵ هەڵدەسووڕێ بۆ خراپە؟ ئێمە پێمان وانیە هەرشتێکی کۆن بێ خراپە وهەر شتێکی تازە بێ زۆر چاکە. زۆر شتی کۆن هەن کە پاش هەزاران ساڵ تەجرووبە و ئەزموون وەدەست کەوتوون و نابێ لە دەستیان بدەین .

· سەرکەوتووبی .

**بیرجەند:** محەممەدرەسووڵ بڵێند

گرامی

نامە ودیاری یە جوانەکانت گەیشتن زۆرت سپاس دەکەین . ئەوەش وڵامی پرسیارەکانت :

١- بەداخەوە تا ئێستا دایرەالمعارف بەکوردی نەنووسراوە

٢- دەستووری زبان یا رێزمانی کوردی زۆرە و لە کتێبخانەکان بپرسە دەست دەکەوێ .

٣- نێوی دوازدە مانگی کوردی بریتین لە: خاکەلێوە، بانەمەڕ،جۆزەردان،پووشپەڕ،گەلاوێژ خەرمانان، رەزبەر، خەزەڵوەر، سەرماوەز، بەفرانبار، رێبەندان رەشەمە،.

٤- سروە لەساڵی ١٣٦۴ را دەستی کرد بە بڵاوبوونەوە .

٥- بۆ سەرگوزەشتی مامۆستا هێمن بروانە پێشەکی تاریک و روون .

**سەردەشت:** خوشکە نەسرین واوی

ئێمە لە خودامان دەوێ ئافرەتانی کوردستان لەجووڵانەوەی فەرهەنگی وکۆمەڵایەتی دا لەهەموو بارێکەوە شان بەشانی براکانیان هەوڵ بدەن. زورجاری وا هەیە بۆ تەشویق و هاندانی خوشکەکان بابەتەکانیان خۆمان دەستکاری دەکەین ودەیهێنینە رادەی بلاو بوونەوە!

رەنگە بابەتەکانی بۆت ناردوو- ین زۆر باش نەبووبن بەو دەلیلە بڵاومان نەکردوونەوە بەلام رامەوەستە. تێکۆشە و بەرهەمی خۆت بنێرە. ئەگەر باش بوون بڵاویان دەکەینەوە .

**سەقز:** کاک ئەحمەدی رەزایی

برای بەرێز کتێبی رێنوێنی کوردیمان بەلاوە نیە. تەنیا کتێبی یەکەمی خوێندنی کوردیمان هەیە کە بۆچاپ ناردوومانەتە تاران. لەدۆستان داوای یارمەتی بکە تا فێرە کوردینووسین بی.

**مەهاباد:** خوشکە ماندانا ...

نامە جوانەکەت بە هەموو رێنموونیە جوانەکانتەوەگەیشت تا بۆمان بکرێ ئەو کارانەی پێویستە دەیان کەین. بەڵام بە پەلە مەبە. ناکرێ لە چەند گۆواردا هەموو شاعیر وەدەنگ خۆش وهونەرمەند ونووسەری کورد و ئێرانی بناسێنین. تا ئێستا **١٧** ژمارە لەسروە دەرچووە کە باسی **١٧** شاعیر و **١٧** هونەرمەند و **١٧** زانای کوردی تێدا هاتووە. بەزیاد بێ کەمە!؟ موساحەبەشمان دەست پێکردووە. محەممەدی قازی موساحەبەی دەگەڵ کراو و دیتت .موساحەبەی مامۆستا هەژاریش ئامادەیە. باسی سەید عەلی ئەسغەر و کاک محەممەدی ماملێ و... لە داهاتوودا، دەکەین.

زۆر کارمان بەدەستەوەن کە داخوازەکانت وەدی دێنن.

ئەوەشت لێ قەبووڵ ناکەین کە سروە لەباری نێوەرۆکەوە ئوفتی کردبێ. بێ ئینسافی هیچ دەردێک دەرمان ناکا.

**بۆکان:** کاک سەلام شوارە

لێمان ببوورە کە وەڵامی نامەت نەدراوەتەوە. تکایە ئەو نەقاشی یانەی پێت وایە بۆسەر بەرگی سروە دەبن بۆمان بنێرە تا ئەگەر پەسند کران کەڵکیان لێ وەرگرین. رێنوێنی ئێمە لەو بارەوە ئەوەیە:

١ـ سووژەی نەقاشی تادەکرێ لەمەر ژیانی کوردەواری و داب و شوێنی وڵات بێ.

٢ـ کۆپی نەبێ لە رووی، نەقاشی کلاسیک نەکێشرابێتەوە.

٣ـ لەباری هونەری یەوەپەسند بکرێ.

سەرکەوتووبی.

**ورمێ، گوندی میاوق:** قادر شکارچی

برای خۆشەویست بەشی کوردی شیمال لە سروەدا زۆر کراوە. لەژمارە ١٧ را ئاڵ و گۆڕی پێویست پێک دێ وبەشی کوردی شیمال زۆرتر دەبێ.

بابا مەردووخ رووحانی (کوردستانی) دانیشتووی تارانە و ئەهلی شاری سنەیە وهەزار ساڵی عومر بێ هەرخەریکی کاروتێکوشانە لە رێگەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیدا.

**مەهاباد- گوندی دریاز:** ئەبووبەکر دەرباز

زۆرمان پێ خۆشە لەبەر سروە خوێندنەوە ناویان ناوی ئەبووبەکر ـ ی سروە ئێمە ...ەیکەینە (ئەبوو سروە) هیواداریین سروە بۆ خوینەرانمان هەروا سەرنج راکێش بێ.

وەلامی پرسیارەکانت بەم جورەن:

١ـ کتێبی "تاریک و روون" لەلای ئێمەش دەست ناکەوێ.

٢ـ گۆواری سروە بەهیوای خودا هەتا سەدان ساڵی دیکەش هەر بڵاو دەبێتەوە وهیچ قەرارو برپارێک نەدراوە کە پاش ١٨ ژمارەی دیکە کاری رابوەستێ و بڵاو نەبێتەوە.

٣ـ "موسابەقەی فەرهەنگی" فکری چاکە و ئەگەر بکرێ لە سروەدا دەی گونجێنین.

**بۆکان:** کاک جەعفەرفەقێ میری

سپاس لە هەستی جوانت. زۆرمان پێ خۆشە نووسەران و لایەنگران باسی گیروگرفتی ژیانی دانیشتوانی گوندەکانمان بۆ بنێرن وبڵاوی کەینەوە. تائێستا لەم بارەوە شتێکی باشمان بۆ نەهاتووە.

کوردی نووسینەکەت هەم لە باری رێنووس وهەم نێوەرۆکەوە زۆر جوانە. هیواداریین سەرکەوتوو بی.

**نەغەدە- گوندی حەلبێ:** مەعرووف نەبی

برای بەرێز: شیعرێکت بۆ ناردووین (قوربانی روخت بم کە شکستی بەقەمەردا ـ حەیرانی لەبت بم کەرەواجی بە شەکەر دا) کە زۆر جوانە. ئەمشیعرەبەناوبانگە وەدەش زانین هی چ شاعیرێکە ئێوەش ویستووتانە بەتێوی خۆتان بڵاوی کەینەوە. نەمانزانی مەبەستت ئەوەیە کەهی خۆتە یان هەر ویستووتە بڵاو بێتەوە؟

تکایە بۆمان روون بکەوە تا پێی رابگەین.

**شنۆ:** ئیبراهیم ئەحمەدیان

ئەمشیعرانە زۆر بەرزن شاپەڕی خەیاڵ وهەستی کوردی کلۆڵن. بەناوبانگترین شیعری کوردین بەڵام بۆت چاپ ناکەین دەزانی بۆ؟ بەو دەلیلە:

شیعری خوالێخۆشبوو مامۆستا هێمنە وشیعرە بەناوبانگەکەی "ئێوارەی پاییزە".

تکایە لەمە بەدوا شیعری خۆتمان بۆ بنێرە.

ئەم ئازیزانەش بەناردنی وێنە یارمەتی سروەیان داوە. پڕ بەدڵ سپاسیان دەکەین و چاوەڕوانی دیاری دیکەی ئەوانین.

مەهاباد: **عەلی رەمەن ـ خالید ئیسماعیلی ـ سەلاح شێربەگی.**

بۆکان: **کەریم سیدقی ـ قادر ئازمەند ـ سەیدکەمال لەتیفی هادی مەحموودی ـ جەعفەر رووحیزاد سەلاح خوسرەوی ـ خالیدقەلعەکووهی.**

سەقز: **ئامینە عەزیزی ـ سەلاح حوسێنزادە ـ عوسمان باژیان.**

نەغەدە: **خدر بەهرام بەگی بەدرەدین ساڵح ـ مراد زایر**

خانی: **مستەفا کەدخودا.**

بانە: **عەباس بنی عەباس ئەسمەر کەریمی ـ قادر خانزادە**

شنۆ: **حاسڵ قادری.**

سنە: **ئیسماعیل .ک.**

تەرخان ئاوا: **بەختیار میعماری.**

# شیوەحاجیلە*

رەسووڵ وەیسی

زۆر داب و رەسم لە کوردەواریدا باوە،کەبەرداشی زەمان لەنێوی بردوون و ئێستا ئاسەواریشیان نەماوە هێندێکیش بەرە، بەرە،بەرەو نەمان دەچن و دێ لەبیر بچنەوە. وەک "شیوەحاجیلە" کە بەرەوپیری گەڕانەوەی حاجیلەیە و لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان باوە.

پیرەپیاو و سەر سپی وڵات بیرەوەریان لەسەر بەڕێوە بردنی ئەو رەسمە هەیە و من لێرەدا بەپێی توانست بۆ روون بوونەوەی خوێنەرانی بەرێز وبەرگری لە لەنێوچوونەوەی ئەم رەسمە باسی لێدەکەم.

حاجیلە ناوی جۆرا وجۆری هەیە وەک لەگلەک، لەق لەق، حاجیلە و...

حاجیلە باڵندەیەکی بە بەژن وبالا و لەسەر لینگەبەژنی رەنگە بگاتە ١٫٢٠ سانتیمیتر. دوو لاق و دندووکی درێژ و سوورن. تووکی لەشی سپی یە وسەر پەڕەی جووتە باڵ و سەر کلکی رەشە. زۆریش هێدی و بێ ئازارە.لە بەستێنی چۆم و نێو زنەو باتڵاخ، مار و کوللۆو بۆق وکرم و....دەگرێ و دەیخوا و لەسەر دەوەڵان وسەربانی بڵیند وسەر دارتێل و شتی وا هێلانە دەکا. نێرە و مێیە بۆ هێلانە ساز کردن یارمەتی یەکدی دەدەن

حاجیلە بەهاران جووت دەبێ وساڵێ چوار هێلکە دەکا و نێرە و مێیە بە نۆرە لەسەر هێلکە دەکەون تا دەبن بە جووچکە.

وەختێک جووچکە لە هێلکە هاتەدەر حاجیلە یەکیان فڕێ دەدا.هێندێک دەڵێن ئەوە جووچکەیەک دەکاتە سەدەقە وبەڵاگێڕی ئەوانی دیکە.

حاجیلە لەجێی گەرم دەژی وگەرمێن و کوێستان دەکا.بەهاران دێتەکوێستان وپایزان بەرەو گەرمێن تێهەڵدەبێتەوە*. بەبڕوای من دەبێ دوو هێلانەی هەبێ یەک لە گەرمێن و یەک لە کوێستان. چون وەختێک دێتەوە کوێستان هێلانەکەی پێدەزانێ ویەک راست دەچێتەوە سەری، کەوابوو لە گەرمێنیش هەر وایە.

حاجیلە ئەگەر بۆخۆشی نەیەتەوە جووچکەکەی دێتەوە سەر هێلانەکەی. زۆرجار دیتراوە لەسەر هێلانە لە نێوان دایک وجووچکە شەڕ ساز بووە.

لەنیوەی دووهەمی مانگی رەشەمە هەرکە شەماڵ لە بەفر وەخۆ کەوت،واتە بای وەعدە هات و پەڵەی گەنارگرتووی بەفر لە قەد و لاپاڵی چڕو کێوەکان چۆڕ چۆڕەیان کەوتە بن ورەوەزە بەرد سەریان لەبن کەوی وەدەرخست،حاجیلە دەگەڕێتەوە و دڵی خاوەن مەڕوماڵات دەگەشێتەوە و دەڵێن لە دیاری شوان نزیک بووینەوە

هێندێک پێیان وایە حاجیلە لە کات وزەمانی دیاری کراودا دەگەڕێتەوە. یانی ٢٠ی مانگی رەشەمە دێتەوە، ئەگەر پێش وەختی

# ١ فروردین
# خاکەلێوە

خۆی بگەڕێتەوە دەڵێن : حاجیلە چڵ وبڕی کردووە.

خەڵک باوەڕیشیان بەوە هەیە کە هاتنەوەی حاجیلە یانی زستانی بەسەخڵەت رووبەندی لەسەر پێدەشت و کێوەکانی سروشت لاداوەو هەموو جێگایەک خەریکە بخەملێن .

حاجیلە کە هاتەوە دندووکی لەسەرپشتی دادەنێ ودەست بە تەقە،تەق دەکا و سەرنجی خەڵک بۆلای خۆی رادەکێشێ. لەو کاتەدا منداڵی کورد لە کووچە و کۆڵانان وە زاق و زووق، دەکەون و بەم چەشنە پێشوازی لە هاتنەوەی حاجیلە دەکەن :

**حاجیلە بەخێری**
**لەدەشتی هەولێری**
**کوری پوورەمیری**
**کاڵۆکان دەپێکە**
**مێوانان بەڕێ کە**
**مێوان کێ و کینە**
**عایشە و فەرەنتینە**
**بەگوارەو دەرزینە**
**سنجاقی خۆم زێڕینە**
**دەخالانم گێڕینە :**
**خاڵی دەقومقومۆکێ**
**چاوی دەنێرگزۆکێ :**
**نێگزۆکم کوتاوە**
**دەموسڵێم بەرداوە**
**مووسڵ بەردێکی خشتە**
**کوچ کوچۆکەی لەپشتە**
**کوچ کوچەنانی دەوێ**
**ئاغاژن پیاوی دەوێ:**

بەبۆنەی بەهاروهاتنەوەی حاجیلە خواردەمەنی پێویست لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن و بۆ شیوە حاجیلەوخرکردنە ـ وەی گیای تازە بەرە و دەشت و کێوەکان هەڵدەکشێن و چێشتی جۆراوجۆر لێدەنێن پاش ئەوەی چێشتەکەیان خوارد ئەوەی لە بەریان ماوە بۆ حاجیلە لەسەر بەردێک یا شوێنێکی دیاری کراوی رۆ دەکەن. پاشان دەست لەدەستی یەک دەنێن و رەش بەڵەک دەگێڕن وبە گۆرانی کوتن وبەزم وشایی کاتێکی خۆش رادەبوێرن . ئێوارە یەک یەک ودوو،دوو بەنێو پەرێزان دادەگەڕێن بەرە بەرە کە کەنگر و مەندۆک ،پنگە وگوڵەگەزیزە و بۆ نۆبەرانە ئەسپینگ و پێکەوک وئەسپنگ وقازیاخە قازیاخە و مەندۆک و...

سەریان لەهەرد وەدەرخست کۆ دەکەنەوە و لەگەڵ کوروکاڵ هەر لەبەرەبەیانی خۆیان دەیهێننەوە ماڵ و ـ یەوە خۆ ساز دەکەن و چێشتی تازەی پێ لێدەنێن.

یاسین قورەیشی

موحەممەدئەمین قورەیشی

# جووتە برای هونەرمەند

مەبەست لەم وتووێژە ناساندنی دوو برای هونەرمەندی کاریکاتۆریست نیە چون کارەکانیان لە زۆربەی رۆژنامە وگۆوارەکانی دەرو ژووری ولاتدا چاپ بووە بەلکوو مەبەستی گرینگ ئەوەیە کە دەمانەوێ وەک گۆوارێکی فەرهەنگی – ئەدەبی ئەوپەری رێز وسپاسی خۆمان پێشکەش بەم دوو هونەرمەندە کوردە بکەین و لە بەرابەر خزمەت کردنیاندا بەئەمەگ بین .

جا بۆیە چووینە بۆکان ولە خزمەتیان دانیشتین و قسەمان لەگەل کردن . سەرەرای ئەوە کە قسەی زۆر بەتام وخۆییان دەکرد ، خۆشیان ناساند و چەند نموونەشمان لە کارەکانیان چاو پێکەوت لێرەدا سەرنجی خوێنەرانی بەرێز بۆ ئەم وت ووێژە رادەکێشین .

– پێش هەمووشت خۆتان بناسێنن .

– پێش هەمووشت سپاسی گۆواری بەرێزی سروە ، دەکەین کە ئێمەی بەسەر کردۆتەوە . جادوایە چون ئێمە هەردووک بەیەکەوە جیبهەیەکی موشتەرەکمان هەیە یەکمان هەردووکمان دەناسێنین!

من سەید محەممەد ئەمین »د قورەیشی یە خەلکی بۆکانم وکارمەندی بانکی کەشاوەرزیم و سالی ١٣٣٠، لەدایک بووم .براکەشم ناوی سەید «یاسین»ە و سالی تەئسیسی سالێک دوای منەا. لە ئیدارەی ئامووزش و پەروەرش کار دەکا . هەلبەت دەبووری چون ئێمە هەردووک کارمەندین بۆ ئەوە کە کەمتر قسەبکەین و سەرفەجوویی لەئێنێرژیدا بکەین هەر یەکمان قسە دەکەین .

– بەلێ هیوادارین سەرکەوتوو بن وبەدلێکی خۆش ولەشێکی ساخەوە لە پێناو خزمەت بە فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی سەرکەوتوو بن .

جا دەکرێ بفەرموون لە کەیەوە دەستتان بە کاری هونەری کردووە ؟

– بەلێ ئێمە هەر لە مندالی یەوە دلبەندی نەققاشی بووین. چ بکەین ئەودەم نەمانزانی هۆگری زێرینگەری وبەزازی وکۆپین

فرۆشی بین وئێستا ئەجیاتی
ئەوە زارەخوارە لەبەر
کۆپین فرۆشێ بکەین وبە
چەند ساڵ جارێک یەکێک
لە لایەن گۆوارێکەوە بێتە
لامان وهەتا کاری پێمانە
قسەمان لەگەڵ بکا بۆخومان
کەسێک بین. جا لە ساڵی
۴۶ لە گۆواری "دختران و
پسران" هێندێک کارمان
چاپ کرا ودوایەش بەرە

بەرە لە گۆواری " سپیدو
سیاه " ، "صبح امروز" ،
"کاریکاتور"، "توفیق"
"فکاهیون"، "خورجین کشاورز"
کارەکانمان بڵاو بوونەوە .
لە یەکدوو نمایشگای
دەرەوەش وەک بلژیک و
یۆگسلاوی هاوبەشیمان کردووە

- چۆنەتی هاوبەشیتان
چۆن بوو ؟

- ئەوان بە رۆژنامەو
گۆوار بەخەڵکیان راگەیا-
ندبوو کە نوێنگەیان هەیە
وئێمەش هێندێک بەرهەمی
خۆمان بۆ ناردن. لەو
دەمەوە بێ برانەوە
هاوکاریان دەکەین و
شتیان بۆ دەنێرین .

- ئێستا کە باسی
نوێنگە هات دەکرێ
بفەرموون نەقشی نمایشگا
لە ژیانی هونەرمەند دا
چیە ؟

- نوێنگە مەکۆی دەربڕین
وپێشانی دانی هەست وکاری
هونەرمەندە. دەتوانێ کاری
هونەری لە نوێنگەیەکی
هونەریدا بێتە هۆی دڵگەرمی
و عەلاقە بۆ هونەرمەند.
لە لایەکی دیکەشەوە
دەبێتە هۆی ئەوە کە
هونەرمەندی جۆراوجۆر لەگەڵ
یەکدی ئاشنا بن و شێوە
کاری یەکدی ببینن .

- بە بڕوای ئێوە
کاریکاتۆر چیە ؟

- کاریکاتۆر یانی
نیشان دانی راستی یەک
لە قالبی شۆخیدا. هەر ئەو
ئەرکەی تەنز هەیەتی
کاریکاتۆریش هەیەتی.دەتوانم
بڵێم کاریکاتۆر تەنزە لە
قالبی نەقاشیدا !
هەڵبەت ئەوە نەزەری
خۆمە. دەنا زۆر تاریفی
جۆراوجۆر لە کاریکاتۆر
کراوە .

- کاریکاتۆرەکانی ئێوە
زۆرتر چ بابەتێکی ژیان
دەنوێنن .

- زۆرتر بابەتی کاری
ئێمە وسووژەی ئێمە کۆمەڵی
کوردەواری وئەم رووداوانەیە
کە لە دەوروبەری خۆمان
روو دەدەن. یا ئەو
مەبەستانەی جێگەی سەرنجن
و بۆ ئەوە دەبن باسیان
لێوە بکرێ. بەرجی ئەوانەش
زۆر تەرجی قورس بە
مێشکماندا دێ ودەیانخەینە
سەر کاغەز.

- لە موسابەقەکانی
خۆولاتیدا بەشداریتان
کردووە ؟

- بەڵێ ساڵی ۶۴
بەشداریمان کرد. لە شاری
بۆکان فەرشێکی سێ وچوارمان
وەرگرت هەڵبەت نەک
فەرشەکە بەڵکووحەواڵەکەمان
وەرگرت و بەپووڵی خۆمان
کریمان. ئەویش فەرشی
کارمەندی یە.

- فەرشی کارمەندی چیە؟

- عەرزبێ فەرشێکە کە
تایبەتی ماڵی کارمەندە .
یانی ئەگەر میوان لە لای
سەرووی ماڵ لەسەر فەرشەکە
دانیشێ هەتا چایەکی بۆ

دێنن، دەگاتە پەناکەوشەکانی
یانی دەخزێ، وەک قالیچەی
پەڕەندەیە! پارەکەش هەر
بەم هیوایە کە بەڵکوو خوا
بکا فەرشێکمان بدەنێ
بەشداریمان کرد. بەڵام
رادیۆیەکی دوو مەوجیان
داینێ ئەویش لە تاران
بەولاوە،مان دەگرێ و هیچ
کوێ ناگرێ. جا ئەوساڵیش
خۆمان ساز کردووە خوا یار
بێ لە موسابەقەدا بەشداری
بکەین بەڵکوو باتری ئەم
رادیۆیەمان بە جایزە بۆ
وەدەر بکەوێ .

نەبوونی نەوتە کە
وەزیری نەفتمان بەرێ کردووە
هەڵبەت دەبێ ئەوەش بڵێم
کە من پێویستیم بە نەفت
و گازۆڵی حەواڵە نیە .

بۆ خوا نەبێ کەس نازانێ
چۆن دەژیم .
یەکی دیکە لە
کاریکاتۆرەکان هەر باسی
نەفتە. سێ تەگەری یەک کە

بەڵێ کاکی خۆم باسی
ئەوەش ناکەم کە فەڕشەکە
لە دوو جێگەوە کون بووە.
- ئەگەر دەکرێ هێندێک
لەبارەی تەرحەکانی خۆتانەوە
بدوێن .

یانی مەبەستت ئەوەیە
کە ئاوردووت هەیە .
- نەخێر! ئەو لە نەوت
گرانترە بەڵام دۆستێکمان
بزنێکی دە لاقی هەیەوئێوارە
بە ئێوارە دەیدۆشن ولەجیاتی

نەوتی ئازاد دەفرۆشێ،ئالای
ئامریکا و شووڕەوی لە
سێ تەگەری یەکەی داوە و بە
موشتەری یەک دەڵێ :
- کاکە ئێستا بەوەندە
دەنا تاوێکی دیکە گرانتر
دەبێ. نرخی ئەم نەفتە
لەگەڵ دۆلار ومارک تەنزیم
دەکرێ وسەعات بە سەعات
دەگۆرێ. لە هەر کوێش
شکایەت دەکەی بکە.سازمانی
میلەل ،شووڕای ئەمنیەت ....
هیواداریین سەرکەوتووبن
بەڵام ئاخر تۆ کە لەجیات
براکەشت وت وویژ دەکەی
بفەرموو ئەو ئێستاچ دەکا
و چۆنی دەگوزەرێنێ .

یەکێ گلەیی یە
لە سروە. بڵاو بوونەوەی
سروە وەک حەواڵەی پەنکەی
دەوڵەتی یە کە زستانان
دەیدەن .
ئەوەی دیکەیان باسی

شیر دوو مەردۆشی گازۆل
هەیە. جارێ بەوە بەرێ
دەچین (مەبەست ماشینی
بێنزی دە چەرخە)،
ئەوەی دیکەشیان ژیانی
خۆمە کە لەحەوتی بورجەوە

- کاکە گوتم کارمەندی
ئامووزش وپەروەرشە . لە
فێرگەکا-ن دەرسی هونەریش
دەڵێتەوە. ژمارەشی ساڵێک
لەمن بچووکترە و نانیش

کەوچکێک لەمن کەمتر دەخوا
بەڵام لە تەرحەکاندا
وەک یەک کار دەکەین. ئێستا

زەماوەندی نەکردووە. یانی
وەک تەونی جرجاڵی بە شەو
دەیتەنێ و بەرۆژ پووچەڵ
دەبێتەوە. هەرچەند جاری
کراس وجلکی ژنی وەبیر
دێتەوە پەژیوان دەبێتەوە.

– لە کۆتاییدا چ
پەیامێکتان بۆ هونەرمەندان
وئەوانە کە تازە هاتوونە
رێزی کاری هونەری یەوە
هەیە .

ئەڵبەت پەیام نا چون
پیاوی گەورە پەیام دەنێرێ
و گەورەییش خەرجی هەیە
ئەم خەرجەش بە هونەرمەند
نادرێ. بەڵام داوا دەکەم
رجا دەکەم لە هونەرمەندان
کارەکانیان لە خزمەت بە
خەڵک دابێ لەرەخنە نەترسن

چون بێ رەخنە هونەرمەند بژی .
قەت سەر ناکەوێ .
هێندێک کەس دەڵێن ئێمە
فێری کاری هونەری نابین .
راستە ئەوانە کەزەمینەی
هونەری یان ببێ زووتر فێر
دەبن بەڵام مەرجی ئەسلی
عەلاقە و دڵگەرم بوونە.
هیچ کەس لەپرێک نەبووەتە
کورێک . هەموو کەس بەشی
خۆی نارەحەتی دیوە. کاری
هونەریش هەر وەتر.

– بە بڕوای تۆ
هونەرمەندی واقیعی کێیە ؟

– ئەم پرسیارە دوو
وەڵامی هەیە. یەکەم لە
باری عیلمی یەوە هونەرمەند
ئەوەی سووژە وەدەردی خەڵک
لە خەڵک وەربگرێ وبیداتەوە
بە خەڵک . یانی لەنێو
خەڵک بژی وبە خەڵک بژی و
بە تەبعێکی هونەرمەندانەوە بن .

وە بەلام لە باری
کۆمەڵایەتی یەوە هونەرمەند
ئەو کەسەیە کوپینەکەی
نەسووتێ وبتوانێ هەموان
وەربگرێ. ماوەیەک لەوەپێش
لە میراوای بۆکان پووڵ
ساز دەکرا. ئەوە هونەرە.
هونەرمەند ئەوەیە بەرۆژێک
بەقەت ساڵێکی کارمەندپەیدا
بکا وپاڵ بداتەوە .... بە
مانایەکی دیکە هونەرمەند
ئەگەر هونەرمەند بێ لەم
عەسرو زەمانەدا حاڵی شپرێوە
ئەگەر کەیفی بەوەبێ دوستێکی
ببینێ یان دوای شێو بانگی
بکا یا پێش شێو دەچێتە
لای .

لە کۆتاییدا لە خودا
دەپارێمەوە رەحم بە حاڵی
هونەرمەند بکا .

– سروەت پێ چۆنە؟

– سروە زۆر باشە .زۆرم
خۆش دەوێ بەڵام جاری وایە
ئەوەندە قەڵەوە هیچ تاکسی –
یەک بێ سێ چوار بەرامبەری
حەقی خۆی سوارت ناکا و
جاری واشە ئەوەندە کزە
دەڵێی :لە ژەهراودا
لەوەراوە . دیسانیش دەزانم
گیروگرفت زۆرە و لەوانەیە
ئێمەش کارەکانمان لەسەر
دەرک ودیواران بکێشینەوە یا
ئەگەر خەڵک گۆشتەکەیان خوارد
لەسەر چەرمە گا .

– هیوادارین سەرکەوتوو

**پاشماوەی سەروتار...**

سوالات متعددی را مطرح کرده‌اند وما لازم دیدیم که‌در این فرصت درباره مهمترین مسائل مطرح شده با شما به‌صحبت بنشینیم. یکی از مواردی که‌درنامه‌ها تلفنها وصحبتهای حضوری بسیار از آن سوال میشد، **علت تاخیر در چاپ و توزیع "سروه" بود**. علاقمندان زیادی ازاین بابت ناراحت بوده وگلایه میکردند. عده‌ای نیز **از کم‌شدن صفحات نشریه** وتعداد کمی دیگر ازجنس **کاغذ** انتقاد داشتند. سیل انتقادات و سوالات بحدی بود که فی الواقع فرصت پاسخ جداگانه برای همه میسر نبود. قبل از آنکه توضیحاتی چند را به محضر شما ارائه نمائیم، لازمست تاکید کنیم که توجه و حساسیت شماعزیزان علیرغم آنکه فشاری را متوجه دست اندرکاران این مرکز میکرد، اما بسیار خوشحال کننده و امیدبخش بود. این احساس خوانندگان که "سروه" را از آن خود دانسته وبدقت مسائل مربوط به‌آن رادنبال نمایند و توقع داشته باشند که‌نقطه‌نظرات خود را درباره مجله محبوبشان مو به‌مو محقق بیابند ونسبت به سرنوشتش حساسیت لازم را بخرج دهند، پشتوانه‌وانگیزه بسیار بزرگی برای همه ما دراین جهاد مقدس فرهنگی محسوب میشود. ماضمن آنکه از همه شما عزیزان سپاسگذار هستیم به شما حق میدهیم تا تمامی مراحل کار رابطور جدی پیگیری

# سعی خواهیم کرد بمحض برطرف کردن مشکلات یادشده نسبت به افزایش حجم سروه اقدام نمائیم

نموده وابهامات و سوالات خود راباما درمیان بگذارید. ازکاستی ها ونواقص انتقاد کنید و با پیشنهادات و راهنمائیهای خود ارائهٔ طریق فرمائید. اکنون وقت آنست تادرباره زمان انتشار، حجم و..... "سروه" توضیحاتی رابعرض برسانیم:

**توضیحاتی درباره سروه**

همچنانکه خوانندگان محترم میدانند این مرکز به‌مدت دو سال بطور فصلی سروه رامنتشر نمود و در پایان سال دوم درنتیجه تقاضای بیشمار علاقمندان "سروه" تصمیم گرفت تا به‌ماهانه کردن آن اقدام نماید. متاسفانه اجرای این تصمیم مصادف با بروز مشکلاتی نظیر کمبود کاغذ زینک و...گردید. درنتیجه علیرغم تلاشی که برای تهیه، تدوین وتنظیم "سروه" (بطور ماهانه) صورت‌گرفت ومجله برای ماهانه شدن مهیا شد، مشکلات چاپی یادشده موجب گردید تا وصول آن با تاخیر زیادی روبرو شود. وبدین ترتیب "سروهٔ" فروردین ماه در

پایان بهار سال ۶۶ بدست خوانندگان رسید وبهمین صورت چاپ شماره‌های بعدی نیز بادشواری و تاخیر همراه گشت .در خلال این مدت تلاش زیادی معمول و با بعضی از مسئولین صحبت شد وسرانجام پس از رفع موانع وفراهم ساختن کاغذ وزینک و....... کار چاپ به‌روال معمول بازگشت . این فرصتی بود تا نشریات ماههای بعدی که کار چاپ آنها باوقفه روبرو شده بود بچاپ برسد همچنانکه خود شاهد هستید پس ازوقفه‌های متناوب طولانی ،چاپ چند شماره اخیر باسرعت بیسابقه‌ای صورت گرفت تابدین ترتیب بتوانیم روال کار راعادی ساخته وشماره‌های بعدی در موعد مقرر بدست علاقمندان برسد وامیدواریم بتوانیم این سرعت را درآینده حفظ نمائیم.مطلب بعدی موضوع کاغذ نشریه است . دراین رابطه باید عرض شود که متاسفانه جز نوع کاهی کاغذ دیگری دردست نیست واین مشکل گریبانگیر افراد وموسسات بسیار دیگری نیز هست .تهیه کاغذ سفید از بازار آزاد هم‌دشوار وهم پرهزینه خواهد بود و ما سعی کرده‌ایم که برقیمت "سروه" افزوده نگردد. از سوی دیگر تضمینی برای تهیه همیشگی کاغذ به‌این روش وجود ندارد.در هرحال چنانچه امکان چاپ "سروه" با کاغذ بهتر فراهم شود دراولین فرصت نسبت به این مهم اقدام خواهد شد. عده‌ای ازخوانندگان محترم ازکاهش حجم"سروه" گلایه داشتند دراین باره درگذشته وقتی طرح ماهانه شدن "سروه" اعلام گردید ،توضیح دادیم ویادآور شدیم که مشکلات تهیه مطالب (باتوجه به‌کاهش $\frac{2}{3}$ درزمان انتشار ) ازیک سو و مشکلات فنی چاپ موجب میشود تاازحجم "سروه" کاسته گردد. هرچند امیدواریم کاهش قابل ملاحظه درزمان انتشار"سروه" کاهش درحجم آنرا امری موجه ومنطقی جلوه داده‌باشد ،لکن باتوجه به‌تقاضای زیاد علاقمندان سعی خواهیم کرد بمحض برطرف شدن موانع یادشده ، نسبت به افزایش حجم اقدام نمائیم. چنانکه هشت صفحه "بسوی زبان مشترک "(که شرح آن درسروه رفته است) بدان افزوده ومطالب مربوط به لهجه‌های مختلف که بعضا" حدود ده صفحه را شامل میشد ازاین پس جای خود را به‌مطالب عام خواهند داد.امیدواریم این توضیحات مختصر، علاقمندان "سروه" را که به‌واقعیات‌توجه دارند، قانع نماید.

**ارتباط بین ما وشما**

برقراری واستمرار در ارتباط نزدیک وتنگاتنگ بین این مرکز وشما مردم خوب وشریف،از ابتدا تاکنون، یکی از مهمترین مسائل ما محسوب شده و میشود. در این راستا تلاشهایی صورت گرفت و برنامه‌هایی چند بمورد اجرا گذاشته شد تانزدیکی کافی بین این مرکز ومردم بوجود آمده وبدینسان از یکسو آنان با احساس هرچه بیشتر تعلق "سروه" به‌خود، درجهت تغذیه و بخشیدن غناء وافی به آن تلاش کرده وبا پشتیبانی ومضاعدت خود به کانون این جهاد مقدس گرمی بخشند وازسوی دیگر"سروه " با پیداکردن مخاطبین بیشتر وحوزه نفوذ وسیعتر در ارتقاء سطح آگاهی وفرهنگ مردم عزیزمان به‌توفیقات جدی نائل گردد.

تلاشهای بعمل آمده هرچند به‌ارتباط گسترده‌ای انجامید لکن، بررسیهای بیشتری برای ارتقاء کمیت وکیفیت این ارتباطات بعمل آمده که بحث تفصیلی آنرا به‌شماره آینده موکول میکنیم

"خدا نگهدار"

چ وێنەیەک بکێشم ، تابلۆیەک لە رووی ئەم دیوارە هەڵواسم ،کاتێ خۆم کوشت ،کە دەرگا کرایەوە سەیری تابلۆکە بکەن سەریان سوڕ بمێنی ؟! چاکترە ئێستە خۆم بکوژم. ئەوەتانێ گوریسەکە ، لە ملمی گیر دەکەم وشەقێکیش لە میزەکەی ژێر پێم هەڵدەدەم تا بە یەکجاری نهێنی یەک بەجێ بهێڵم .

چاکترە خۆم بکوژم ؟!

بۆخۆم بە تابلۆیەکەوە ماندوو بکەم؟ نا! تابلۆکە دەکێشم با ژوورەکە لێم تێ بگات . بەڵام ژوور، مادەیە ودەنگی دەرنایەت؟ مرۆڤانی ئەمڕۆش هەربەم جۆرەن .کەواتە خۆکوشتنەکەم باشترین چارەیە ؟!

ئەمە فایلێکی* سپی یە تابلۆیەکی جوانی لێ دروست دەبێ پێنووسەکەش بەدەستمە- نهێنی یەکەم دەکات ،تابلۆ دروست دەکەم و بە دیوارەکەی هەڵدەواسم.دەست پێ دەکەم !

" ئەم هێلە زەوی یە ئەم مرۆڤانەش لەسەری دەژین بەڵام هەموویان ناپەسەندو دزێو ومشەخۆرە*کانی ئەم زەمینەن. کەواتە کەس تیا لە مرۆڤی راستگۆناچێ بەلای چەپی تابلۆکەدا مرۆڤێکی لاواز و بچووک کە

نا ! دیوارەکە رووتە ،تا ئێستا تابلۆیەکم پێیا هەڵنەواسیوە .جا تابلۆکانی ئەمڕۆ تەعبیر لە چی دەکەن ؟! باخۆم تابلۆیەک بکێشم ودواڕۆژی دەروونم وابەستە بکەم بەدەروونی زۆر مرۆڤەوە، کەناتوانین نهێنی یەکان لە لای یەک بدرکێنین .

بەڵام پاش خۆ کوشتنم تابلۆکە دەسووتێنن،مەبەستم ناگاتە ئەو مرۆڤانەی کە دەروونیان لەگەڵم دایە .

وەیە، دوو خەت دەکێشم. بۆ مانایە؟! دەزانم، بەڵام دوای خۆ کوشتنم فەیلەسووفەکان دێن لەو دوو هێڵە* دەکۆڵنەوە ولە خەڵکی دەکەنە ئەفسانەیەک وبڕوایان پێ دەهێنن ؟! ئەگەر ئەوەی لە دڵمایە بیکێشم ئەوکاتە زوو دەی سووتێنن ونهێنی یەکە دەشارنەوە .

خۆم دەکوژم ،جاچاوەڕوا- نی چی دەکەی ؟! بەڵام دیوارەکەش داوای تا چاک تێی نەڕوانی نای دۆزیتەوە . خاڵێکی بچووکە دەبزوێ. تیشکی زێڕینی راستگۆیی پێوە دیارە.ژێر زەوی یەکەش نابێ هەروا، بە ئاسانی جێ بێڵم ،چونکە لەوێش کۆمەڵێ مرۆڤی سپی و سوور، زەردورەش، هەموو پێکەوە دەژین ! دەیانەوی بەسەر زەوی دا هەڵگەڕێن. بەڵام جارێ خەریکی دروست کردنی پەیژەن* ؟!

تابلۆکە کۆتایی هات . لە دیوارەکەم چەسپاند.دوو

هەنگاو لێی دوور کەوتمەوە و تێمڕوانی .

زەوی یەک کۆمەڵی مرۆڤی دڕندەی تێدا دەژین، لەژێر زەوی یەکەش کۆمەڵی مرۆڤی تر، تێ دەکۆشن، دەیانەوێ وەکوو بوورەکان لەناخی زەوی درزێک بدۆزنەوە و بتەقێننەوە ! لەنێوان سەرزەوی و ژێر زەویدا نوێنەرێک دەژیت و دەبزوێت . دەگەڕێ لە کون وقوژبنی شارەکان تا پەیژەیەک پەیدا بکات .

ئەمیش تابڵۆکە ئیتر خۆت بکوژە، چوومە سەر میزەکە و ئاوڕێکم لە تابڵۆکە دایەوە .هەروا، دەمێنێ یالە گۆڕاندایە ؟! کەواتە بۆخوم بکوژم، با دەرگا بکەمەوە و هاوار بکەم.خۆم ناکوژم. بەلام گۆڕانی تابڵۆکە چەندین ساڵی دەوێ.خۆکوشتنەکەم باشترە، چونکە ناتوانم چاوەڕێی ئەم هەموو ساڵە بکەم. ئێستا لەسەر میزەکەم، بەهەردوو دەستم گوریسەکە لەملم دەئاڵێنم و شەقێک لەمیزەکەی ژێرپێم هەڵدەدەم، ماڵ ئاوایی لە ژیانی پڕکوێرەوەری دەکەم.

ماڵ ئاوا ئەی ژوورە، ئارام وماتەمینەکەم.

دواجار ئاوڕ لە تۆ دەدەمەوە تابڵۆ نەمرەکەم؟!

ئەو مرۆڤەی لە لێوتا دەبزوێ، پەیژە بەدەستیە — وەیەتی ؟! ئەم پەیژەیە من نەمکێشاوە؟! لەکوێ وە هات ؟! دەبێ کەس لەم ژوورە هەبێ ؟! دابەزیم لەسەر میزەکە ودەرگاکەم لەخۆم یەکالا کردەوە.لەپڕ ڕەشەبایەکی بەهێز تەوژمی هێنا، ئەمنی کەواندە سەر زەوی. هەستامەوە سەرپێ و دیتم ڕەشەباکە میز* و پێنووس وگوریس وتەپڵەکی لەسەر زەوی یەکە پەڕش و بڵاو کردبووە .

پاشان سەرێکم هەڵبڕی و سەیری تابڵوکەم کرد. دیتم تابڵۆکەش سەرەونخوون کراوە !! بزەیەک هاتە سەرلێوم و لە ژوورەکە دەرپەڕیم !....


چون خۆشەویستان ولایەنگرانی سروە لە دەروژووری وڵات بە نامەی جران ورازاوە داوای "فۆڕمی ئابوونمان"یان کردووە، ئەوە چۆنەتی ئابوونمان لە دەروژووری وڵات بەو شێوە رادەگەیەنین

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆنێو خۆی وڵات | ٢٠٠ | تمەن |
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆ وڵاتە دراوسێکان | ٣٨٠ | تمەن |
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆ هیند وئورووپا | ٤٢٠ | تمەن |
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆئامریکا وخاوەری دوور | ٥٠٠ | تمەن |

ناونیشان : اورمیە ـ صندوق پستی ٧١٧ ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی ـ تلفن ٠٣٥٧٠٠٠

بۆ ئەم خوێندکارانە کە لە زانستکاکانی دەرەوە دەخوێنن ( ئەگەر بەڵگەی خوێندکاری خۆیان بنێرن ) هەل و مەرجێک پێک دێنن کە گۆواری سروەیان بەنیوە قیمەت پێ بگا .

# رێنوێنی ئەدەبی

**بۆكان :كاك كەريم كەريمی**

شيعرەكانت كزن بە تايبەتی كە وەزنەكەيان لەنگە.

چاوەڕوانی شيعری جوانتری ئێوەين .

**شنۆ: خوشكە م. ئەديب**

ئێمەش هيوادارين نەمامی "سروە" بەهاری دڵرفێنی بەسەردا بێ و هەموو مانگان گوڵێكی بۆن خۆش بدا بەخوێنەران ولايەنگران. شيعری پايزی مامۆستاگۆران بەراستی جوانە . زۆر مەمنوون كەبۆت ناردووين.. ئەوەش بەبۆنەی پائيزەوە چەند دێرێك بۆخوێنەران لەو شيعرە :

پايز ! پايز !
بووكی قژ زەرد
من مات تۆ زيز
هەردووكمان هاودەرد

* * *

پايز ،پايز شان ومل
رووت
من مات تۆ زيز
هەردووكمان جووت

* * *

**خۆزستان:كاك شيواوهـ. ق :**

نامە جوانەكەتمان پێگەيشت كەدەكرێ بڵێين پارچە پەخشانێكی جوانە بۆخوت نووسيوتە :

"لاپەڕی ويشكی كاغەز هەستی دەروونی ئاگرينم نادركێنێ. پەڕاوپەڕ وشەی ناسك لەژێر نووكی خامە دەخزێ و بە نازەوە لێم سڵ دەبن و تيژ دێن و دەڕۆن...."

بەلام ئێمە پێمان وايە وشەی ناسك لە نووكی خامەت دەتكێ ورامودەستەمۆ لەسەر لاپەڕەی تەڕوبڕی كاغەز سەف دەكێشن و نامەكەت دەڕازێننەوە....

لە نامە جوانەكەتدا داوای دەستنيشان كردنی هەڵە وكەموكووری شيعرەكانت كردووە. پێشەكی با ئەوەت پێ بڵێين پەخشان باشتر لەشيعر دەنووسی بەلام لەشيعرەكانيشتدا تام وچێژی شيعر بەقەوەتە تەنيا شێوەی داڕشتن و هۆندنەوەی شيعرەكان ناتەواوە. ئەوەش بە خوێندنەوەی قانوونی شيعر دانان و شيعری شاعيرانی بەناوبانگ چارەسەر دەكرێ ئەوەش چەند نموونە لە شيعرەكانت ورەخنەی ئێمە لەسەريان :

**فۆرمی ئابوونمان**

**شمارە**

**ناو.............شۆرەت...............دانيشتووی.....................**

**......تمەنم بەحيسابی ژمارە ۵۴۰۰ ی شوعبەی ناوەندی بانكی سپەی ورمێ گرت و فيشەكەم وتيرای ئەم بەرگە بۆ نادرن . لەژمارە.........را هەتا.......گۆواری سروەم. بۆ بەرێ بكەن .**

**ناونيشان.........................**

..............................................

چی یە تاوانم کەهاتوومەتە سەر ئەو زەویە
دەک نەبێ کەسێ لەراستی دوژمنی سەرنەویە
میسرەعی دووەم لەگەڵ میسرەعی یەکەم دوو وەزنی جیاوازیان هەیە. میسرەعی دووەم وەزنی شیعری نیە و زۆرتر وەک پەخشان دەچێ لەباری مەعناشەوە لەنێوان میسرەعی یەک ودوودا هیچ پێوەندی یەک نیە.
بە یارمەتی خوا لە ژمارەکانی داهاتوودا، هیندێک قانوونی شیعری عەروزی(عروضی) دەخەینە بەرچاوی خوێنەرانی عەزیز.
پیرانشار: **کاک محەممەد وەسیمی**
شیعرەکانت زۆر کزن. شیعری جوانترمان بۆبنێرە تا بلاوی کەینەوە.
بانە: **کاک عەلی حوسێنی**
شیعرەکانت زۆر کزن. لەباری وەزن وقافیەش کەموکووڕی یان زۆرە.
بەهیواین شیعری باشتر- مان بۆ بنێری.
سەقز: **کاک شاهۆ ز.ی.**
شیعرێکت بۆ ناردووین کەهیندێ جێگەی بۆ ئێمە لێک نەدراوەتەوە. لێرەدا بۆ خوێنەرانی بلاودەکەینەوە لە تۆش داوا دەکەین مانای شیعرەکەتمان بۆ بنێری. عاشق (ع ـ ا ـ ش، ق)
عەینی عاشق عەینی عەینە. یەعنی چاوی مەستی ئەو.
شینی شینی شەربەتی شەوق ونیشانی شەمعی شەو.
قافی قومری قولفی قاف و قەتلی شاهۆ قەستی ئەو
کوردستانی عێراق: **شلێر**
سپاس لەنامەی بەسۆزت. بەرنامەی ریزەباسێکی گرینگمان لەمەڕ هونەری تەئاترەوە ئامادە کردووە، بەو زوانە بلاوی دەکەینەوە
**تاران:** کاک موحسین سالمی
شیعرەکەت جوانە. بەلام وەزنەکەی تەواو نیە. نووسیوتە:
**ئێوارەیە**
**رۆژمەلێکی ماندوو**
**هەناسەی ساردی پیرەژنێک**
**لەگەڵ سێبەری دارەکان**
**دیسان چووە نێو چەتری شەو**
**ئێوارەیە**
**دڵ وەکوو مانگی کزی پایز**
**لەنێو ناخی کێوەکان خۆ**
**دەشارێتەوە....**
"**ئێوارەیە**"چوار هیجایە ئەم شیعرە چوار برگەیی یە بەلام دوایە دێتە سەر "**رۆژ مەلێکی ماندووە**"، حەوت هیجایە دەبێ دوو چوار برگەیی بێ. جا ئەم شیعرە بەشێوە ئیسلاح دەکەین خۆشت پاشماوەکەی ئیسلاح بکە.
**ئێوارەیە**
**هەتاو مەلێکی ماندووە**
**هەناسەی ساردی داپیرە**
**لەگەڵ سێبەری دارەکان**
**دیسان چووە نێو چەتری شەو**
**ئێوارەیە**
**دڵ وەک مانگی کزی پایز**
**لەنێو دلی کێوەکاندا**
**بەسپایی خۆ حاشار دەدا**
**چاوی مندالە رووتەکان**
**ئەوا دەروانێتە چیا....**
بوکان: **سولەیمان رەحیمی**
لە شیعرەکانتدا وشەی هاتەوە رەدیفە. جا وشەی گیانە وئازادی وتۆفان و بەهار دەبێ قافیە بن کە قافیە نین.
وەزنی شیعرەکانیشت زۆری، کەموکووری تێدایە.
تەورێز: تەیب ئەحمەدبرواری
شیعرەکەت لەباری وەزنەوە لەنگە. لەباری قافیەشەوە وشەی بابروبایی مشک‌وبوون، خەلات کرم و سوتم، قافیە نین. لەباری نێوەرۆکیشەوە زۆری کەم و کووری هەیە.
شیعری ئەم ئازیزانە شمانپێگەیشتووە کە لاواز بوون نەمانتوانی چاپیان بکەین
سەقز: **خالید**
بێتووش: **حوسێن ئیبراهیمی**
سنە: **ئیقبال ئیبراهیمی**
ورمێ: **جەمال قشووری**
خانێ: **تاهیر سوارە**
سنە: **فەرەیدوون رەهێلە**
مەهاباد: **جەمال کۆکەیی**
ورمێ: **لوقمان موحەممەد**

# شاعیرانی لاو

عەبدولقادر ئازمەند

تەوژمی غەم وەها بیری تەنیوم
بڕاوە بیری چواردەورو پەسیوم
بەدی ناکەم عەزیزێ دڵنەوازێ
بە تەنیا بۆپەنا وخەڵوەت خزیوم
لە ئاوێنەی ئەوینا کەس نەدیوم
لەخێوی ژینی دڵداری هەتیوم
لەمانای بەختما "نووریٚ" دەفەرمویٚ
وەکوو سێبەر لە رووناکی رەویوم
سروشتی کردەوەم پاراوو پوختە
لە بنچینەی ئومێدا تێک رمیوم
پتەولاشەو بە باهۆم داخی گەورەم
بە هەڵمی ئاهی ناکامی رزیوم
لەحاستی کۆستی گەردوون سەروم ئەمما
لەژێر کۆڵی کولیل چرچ و چەمیوم
لە ئەوکمدا قەتیسە بانگەوازێ
ئەوەند پڕتین وتاوە پێی چزیوم
وەنەوشەی مل کەچی جۆباری عەشقم
لەتینی حەسرەتا سیسم وەریوم
گەشەم کەوتێ کەسروەبردێ حەسرەت
روحێکی دی لەنوێی تێدا دەمیوم
هەتا بۆم بێ شنەی ئەم سروە فێنکە
لەبۆ لادانی دژ شێری غەریوم
هەڵۆی تیژباڵی وێژەم تا ئەوم بێ
بەڵێ "قادر" بەرەوهیوا فڕیوم

قادر بابامیری

ئەوینت مەشخەڵێکی ئاورینە
ژیانی من بەشێکە لەو ئەوینە
دەسا سەر هەڵبڕە بڕوانە ئاسۆ
ببینە زەردە چۆن هەڵدێ لەرووی تۆ
ببینە تیشکی تاو بێتوو بدا لێت
بە داماوێوە خۆی داوێتە بەرپێت
دەچاو هەڵبێنە بابەو نیونیگایەت
پلەی جوانیت بگاتە بێ نەهایەت
گوڵم دنیا هەموو یەخسیری تۆیە
حوکمداری جیهان چاو و برۆیە
ئەگەر یەزدان دەمی عیسا دەدا بەو
هەناسەت پووچ دەکا سیحری دەمی ئەو
لە دوو لاوە شەپۆلی بسکی خاوە
بەسەر گۆنای زەریفتدا رژاوە
کەزەردەت دێتە لێو ودێیە سەر سۆ
جیهان دێنێ گوڵی ئاڵی دەمی تۆ
بەدانستە لە گەوهەر تاشراوی
لەبەر حوکمی خودای جوانیش نەماوی
بەرەو رووت بۆ عیبادەت رادەوەستم
لە قەرنی بیستەما من بوت پەرەستم

هەتا جێگەت پەڕەی دڵ بێ عەزیزم
بە ئامێزی گوڵێش متمانە ناکەم
کە تۆ شەمعی شەوانی تاری من بی
لەدەورەت چۆن وەکوو پەروانە ناکەم؟

تاهیر روستایی

لەهەر شوێنێک خۆر
گزنگی هەڵبێ
مەلێک لەلانەی دڵم هەڵئەفڕێ
خەندەی پیرۆزی لەتیشکی ئەسوێ
لەهەر شوێنێک خۆر
گزنگی هەڵبێ
نیگای ئارەزووم تینێتوی ئەشکێ
لەهەر شوێنێک خۆر
گزنگی هەڵبێ
گوڵێک لەباخچەی ئومێدم ئەڕوێ
لەهەر کوێێک
هەورێک روو لەخۆر بگرێ
چ فەرهەنگوکی شیعری ورد هەیە
تیگرا
دێنە جێژوانی شیعری نوێم

پەرویز جیهانی

ئەز دخازم، خودێ کەم،
کێرێ هلدەم دلێ خوە
ژبۆ تە تیش و کەرکەم
دلێ خوەیی ئەڤیندار
ل پێش چاڤێ تە وەکەم
لێ وەلێ ئەز دترسم،
ترسم کێرا دەستێ من ،
پشتی بڕینا دلا،
بگیژە ناڤ سۆر گولا،
ئیجا هینگا بێی سۆر گول
ئەزێ چ خالییێ ل خو کەم
خازی ، خازی ئەیجانێ
من بکاریا ئەویە کا ،
ژ بۆتە وا بکرا
یانێ دلێ خوەژ تەڕا
ب کێرەکێ کەرکرا

حەتا تە بچاڤێ خوە
ل خوونێ دا ناڤێ خوە
بینا بەژن و تیشکا چاڤ
بدیتا ناڤ نەینووکا
دلێ پاخسێ لێدایی
دلێ برین و کولدار
کوتە تێدا پالدایی
خازی خێرا مرازا
هەبا دەستێ خێر خازا
بۆ من بدا ئەو کێرا
تا من ل پێش چاڤێ تە
لبەر پێ و گاڤێ تە
دل کەر کرا ئارامی
تەژی بچاڤ بدیتا
توو خوونا دل خنامی
خازی ، خازی ، سەد خازی
ژ بۆ روحێ مرازی
جانێ م ژی بکاریا
بینا تەیا ناڤا دل
ب نەینووکێ بدادەر
تە بدیتا چاڤێ سەر

تویی لناڤ دلێ کەر
حەتا تە دکر باوەر
کو بینەیاتە یا گول
روونشتییە ناڤا دل
کو بینەیا تە یا گول
رونشتییە ناڤا دل
خازی ، خازی ، سەد خازی
دەستەکی هۆتۆ هەبا
کو دلێ هەر دلدایی
وەکرا ب رۆناهی
ل پێش چاڤێک تێدایی
حەتا ئەوان چاڤانا
خو ناڤ گۆلا خوونێ دا
بدیتانا سۆمەکار
ئێدی رەبەن ئەڤیندار
نەکرانا لۆمەکار
ئێدی رەبەن ئەڤیندار
نەکرانا لۆمە کار

# سەرهاتییا گیكۆر ۱

## كافی رێبسار ئینایە سەر رێنڤیسا كوردی

مالا هامبۆیێ گوندیدا شەڕو دەعو بوو.

هامبۆ دخوەست گیكۆرێ خوەیێ دونزدە سالی ببە شەهەر، بدە سەر شوخولەكی، وەكیببە مەری، بخەبتە. ژنا وی قایل نەدبوو:

-ناخوەزم، تفالێ من نەبە وێ دنییا زولمێ ناخوەزم، ژنا وی دگرییا.

لێ هامبۆ گوە نەدایێ.

سبەكە خوەشبوو. سبەكە مەلوول، نەفەرێ مالێ و جینار حەتانی پەرێ گوند هاتن.

سوورەتێ گیكۆر پاچ كرن و قەرێكرن. خووشكا وی زانێ دگرییا، لێ گالۆیێ بچووك بەرملا دێ دكرە گازی:

-" گیكۆل، تو كودا، دچی؟ هەیی گیكۆل!"

گیكۆر زوو، زوو، پش (پشت) خوەڤا دنهێڕی. ددیت وەكی ئەوانا هەلاپەرێ گوند سەكنینە و دیبا وی پێ شالكا خوە هێسرێ چەعڤێ خوە تەمز دكە. دیسا رەخ باڤێرا درەڤیا، یانێ ژی پێشییی دكەت. جارەكی ژی گیكۆر پش خوەڤا نهێڕی، گوند ئێدی پش تۆپكدا ئوندا ببوو. پاشێ گیكۆر هەی پاڕا دما:

-"دەوەرە گیكۆر جان، وەرە ها ئەم گهیشتنێ ها."

هامبۆ گازی كورێ خو دكر و دچوو. خورجەك پشتێ بوو. خورجكێ دا چەند نان، پەنیر ودەستە دو دو تتوون هەبوون.

بەری ئێڤارێ، وەختی ئەوانا ناڤا چییاڕا دەرباز دبوون، جارەكی ژی ناڤا دوومانێدا گوندێ وان دوورڤا خوویا كر:

-"ئەدە ئای مالا مە ئەوا هانە ها!..."

گیكۆر تلییا خوەدرێژی گوند كر، لێ مال ئێدی نەدهاتە خوویا كرنێ وئەو دەرباز بوون وچوون.

ئێڤارا ئەولن ئەوانا گوندەكی دا بوونە مێڤان. مالخویێ مالێ دوستێ هامبۆ یێ كەڤن بوو.

سەماورا قیچك سەر تەختە دكرە قلپە،قلپ. قیزەكە جاهێل شخكە شخكا وێ بوو، فینجان دشووشتن و چایێ حازر دكر. دێرەكی سۆری بە- دەولێ بوو. وێدەرێ گیكۆر دلێ خوەدا گۆت:

"وەكی وەختا شەهەردا پەرە بكەڤنە دەستێ، زانێ را دێرەكی وی جورەیی بكرە پەی شیڤێ را مالخێ مالێ و هامبۆ پالا خوە دابوونە بەعلگی یا وقالن(قەلوون) دكشاندن وقسە دكرن. دەرهەڤا گیكۆردا خەبەر دان مالخویێ مالێ پەیی هامبۆدا وەكی دچرچرە (تێدكۆشە)كورێ خوە بكە مەری (مرۆڤ).

پاشێ دەرهەڤا شیرێ دا، بهابوونا ناندا خەبەر دان لێ گیكۆر زەعف (زۆر) وەستیایی (ماندی) بوو، خەو ڕاچوو.

رۆژترا ماین ئەوانا گهیشتنە شەهەر. چوونە جەم تەولەچییی كال،سبێ چوونە بازارێ.

ژ هوندور دكانەكی توجارەكی پرسی:

-"كالێ وێ زارێ دخازی بدی خولام؟"

هامبۆ جابدا:

- "بەلێ ئاغا"

وگیكۆر وی ئالی دا دەعفدا (پالدا).

توجار گۆتێ:

" بینە بدە من،ئەزێ بكەم خولامێ خوە."

وی ڕا دگۆتن ئارتێمی توجار

هامبۆ گیكۆر مالا ئارتێمێ توجاردا كرە بەردەستی.

قەول و قرارێ وان ئەو

بوو، وەکی گیکۆر گـۆتـــی مال تەمز کـــرا ، دەردا* ن بشووشتانا ، ملاس تەمزکرانــا نان ببرا دکانێ وخەباتـــێ هاسڤک بکرا، حـەتـانـــی سالەکی. پەیێ سالـەکـی ڕا گۆتی ئەو ببرا دکانـــێ بکرا " شاگرت " و ب ڤــی جورەیی گیکـــۆر گـەرەکــی پێشدا بچوویا .

توجار وەختێ گرێدانا قەول و قرار گۆت :

" حەتانی پێنج سالا ئەز هەلا پەرا نادم. هـەقییـێ کەڤە گەرەکی هەلا (هـــێ ) تو بدی، وەکی کورێ تەیێ تشتەکی هین بە.

ئاخر قەت تشتەکی نزانە....

هامبۆ گۆتی :

" خەزین جان،وێ کوزانبە ، وەکی بزانبوویا ،ئێدی منــێ چرا بانییا ،من ژی ئانییە وەکی تشتەکی هین ( فێر ) بە...

– وێ هین بە ، وێ حەموو تشتی هین بە ،وێ ئوسا هین بە وەکی ....

ئەو " نیکۆلێ " ئالییی وە چ! وەکی خوەڕا نها دکـــان ڤەکرییە ، ئەو ژی جەم مـــن بوویە مەری. لــێ هـەمـا ئاخری یێ دو کەڤچیێ چایێ و چەند تشتێ مایین دزین...

– نا خەزین جان ،ئەڤـــا نادزە، وەکی تشتەکی ئوســا بکە، ئەزێ بێم ملێ وی ڕا بگرم وباڤێمە کۆرێ*.

– ئەرێ، وەکـــی دەســـت درێژایێ نەکە وێ ببە مەری.

– دەردێ من ژی ئــەوە ، ئاغا جان، وەکی ببە مەری، زمێن (ئەزمانی) هین بـــە نڤیسار وخوەندنێ هین بە، رابوون ورووشتنێ هین بە مەری یا ناسکە ، وەکـــی دنیایێدا مینا (وەکی) مـــن بەلەنگاز و فەقیر نەمینە.

ئەو ژی زاڕۆکە چـەعـــڤـ ڤەکرییە. ئیشکۆلا گونـــدێ مەدا وەکی هین بوویــــە، حەرفا ناس دکە. لێ هیڤی یا من ژ تە ئەوە وەکی ڕنـد گوە بدییێ،زاڕۆکە ،خەریبە، تفالەکە....

توجار هامبۆ ئارخایـــن (پشتگەرم) کر و دەرکەتــە دەرڤا ، ب دەنگەکی بلنـد ئەمر کر :

" نان ، چایێ ڤـانـارا بینن ! "

باڤ وکوڕ ئاسپێژخانـا ئارتێمـــێ تــــوجاردا روونشتبوون .

– دە گیکۆر جان ، ئێدا تو دزانی، ئەزێ ببینم ،جکا کوڕەکی چاوا ژ تە دەرتێ.... تو گەرەکی ئوسا بکی وەکی... ئەز چ زانم؟ یارەبـــــل‌ـ عەلەمی.... هامبۆحەزە*نگەک (کەسەرەک) هاتێ و قەلـنـا خوە داگرت .

لێ گیکور ژی هەر چـــار ئالییێ خوە مێزە* دکر.

– ئەدە بخێری یا ڤـــان تونە ؟

– نا ، یاڤان سۆبەیـە، ئایی ئەواهانە...

– بێدەرێ ڤـــان ژی ، تونەنە ؟

– ئەڤانا شەهەرینە ،خوە گوندی نینن ،وەکی بێدە*را (جۆخـین) بکن .

– لێ نان ژ کو تینن ؟

– پێ پەرا دکرن،دخون. نان ژی ، روون ژی، شیر

ژی، قاتخ (ماست)ژی، داراژی ئاڤێ ژی پێ پەرا دکرن.

- پەیی !...

- لێ ڤێرا دبێژن تفلیس ! تو قۆچاخ بە، تێ هەلا گەلە تشتی بزانبی.

- ئەدە...دێرا ڤان هەیە؟

- هەیە لێ، ئەو ژی، مینانی مە ئەرمەنییێ خاچ پارێزن. گوهێ خوەبدە من دەست درێژایێ نەکی... دبە، بۆنا تە بجێرِبینن، پەرا باڤێژنە عەردێ،نێزیکی نەبی. یانێ وەختێ هلدی ژی ببە بێژە.... خانم ئەڤ چ پەرەنە ڤرا کەتبوون، ئاغا ئەڤا تشتێ هان من ڤێدەرێ دیت.... یانێ نا...بێ وەخت جی می یادا، نەچی پەرێ کو دکەڤنە دەستێ تە، کۆر پووچ نەکی، حەزار دەرد و کولێ مە هەیە. رِندمقاتی خوە بە، شەڤێ سەرخوەنەڤێژە خوە نەدەسەرمێ... جارجارا ژی کاغەزەکی بدە مەری یا مەرِا بشینە- هامبۆ هەی قەلوون ژدەڤێ خوە دەردخست و هەی ژی پێرِا کورِشیرەت دکر.

لێ گیکۆر ئێدی دهێنژی. دقەومە هوورکێ نان، نانێ کارتۆ بدەنە تە بەرمایی یا خوارنێ بدەنە تە، گەلەجارا ژی ئەوێ بخون، لی نادنە تە، تشت ناکە. خولامەتی ئوسایە، رۆژن وێ بێن و دەرباز بن...

باڤی هاکور شیرەت دکر. لێ گیکۆر پشتا خوە دابوو باڤێ ئێدی رازا بوو.

وان هەر دو رۆژا ئەوی ئەوقاس (ئەوەندە) تشت دیتبوو، وردا ،وێدا نهێرِی بوو ،وەکی گەلەکی وەستیایی بوو.

دکانێدا تژی ئێمیش،تۆپێ چیتێ رەنگ رەنگی کومینانی لۆدا دانیبوونە سەر هەڤ تیتکێ جورە جورە، کۆمێد زارایە کو دچوونە خوەند- نخانێ، یانێ ڤەدگەرِیان. فایتوونێ کو دابوون پەیێ هەڤ، کارڤانێ دەڤە (هێشترا) مەرکەبێد ب پنجارێ بارکری، کینتۆیێد ( ) سنی سەر سێری، ڤالمەڤالم وڤاژەڤاژ ڤان گشکا (هەموویی) تەڤی هەڤ ببوون وسەرێ وی دا دکرنە گوژە- گوژ. ئەو وەستیایی بوو پشتا خوە دابوو باڤێ و رازا بوو.

وی چاخی توجار و ژنا خوە هوندورِدا دکرنە شەرِ. ژنێ گازنێ خوە دکرن،وەکی خولامی خامە، تەزە ژ چییێ هاتییە، بەیانییە، لێ مێر شابوو، وەکی خولامەکی چەند سالایی بێ هەق گرتییە.

- وێ هین بە،خوە ئوسا نامینە،ئەوێ ژنێرِا دگۆت دێ یا توجارە پیر هیڤی دکر و دگۆت :

-" وێ هین بە لاوێ، قەت دلێ خوە مەکە."

لێ ناتۆ خانم ڤاندرمیش نەدبوو (سەرووەخت نەدبوو) ئەو هەم دگرییا، هەم ژی نفری ل بەختێ خوەدکر

گیکۆر تەنێ ل ئاسپێژخانا ئارتێمێ توجاردا روونشتبوو ئەو ئێدی بەردەستی بوو.

کومێ خەزینێ کەڤن کو دهات دکەتە سەر چەڤا کربوو سەرێ خوە، جۆتە سۆلێ کەڤن (کۆن) کربوو لنگێ خوە. کراسەکی چیت خوە کربوو،سەری حەتانی لنگا ئاها هاتبوو،گوهاستێ ئەو ئاسپێژخانێ دا روونشتبوو، دفکری. وەکی چرِا ژ گوندێ خوە هات کەتە کیدەرێ،نها وێ چ بکە وی چاخی ناتۆخانم هاتە هوندورِ. گیکۆر جییێ خوەدا روونشتبوو.

خانمێ تشتەک گۆت ،گیکۆر رِند نەبهیست، یانێ فەعم نەکر.

- ئەز تەرِانینم، لۆ کۆتکێ حرچا ؟

گیکۆر تەڤی هەڤ بوو، خو یی دا، خوەست بپرسە وەکی چ دبێژە .لێ تورش نەکر خانم ب هێرس دەرکەت :

- ئێ ،خوەلی سەرێ وەبە راستی ژی هوون بەیانینە، هەلاتێن وسەرێ مەری یا ژی

دبنە خەتا... ئەز گلێ* یا (گۆتن) دبێژمێ، ئەو ژ جیێ خوە ژی نساهەژە دەنگێ خوە ژی ناکە....

– کوتا بوو، گیکۆر فکری لێ چاڤ زوو کوتابوو چاڤ خراب کوتابوو...ئەزێ نها چ بکم؟ باڤێ من ژی چوو...

ئەو دفکری، وەکی هەر چار مەجال لێ هاتنە برینێ، گاڤا دی یا توجار،پیرارەحمە کنجێ* رەشلێ بەرخوەدا خەبەر ددا وهاتە هوندورو گۆت :

"وەختێ خانم دەرداتێ تو چرا ژ جیێ خو رانابی لاوۆ ؟"

ئەوی گیکۆر شیرەت دکر وەختا تشتەکی دپرسن دەنگێ خوە بکە... ئوسا نابە !

پیرێ را دگۆتن "دێدێ".

دێدێ گیکۆر هین دکر وەکی چ گۆتی بکە سەماورێ چاوێ باڤێ ژێ ملاسا تەمز بکە، چۆتکێ بگرە،دەردانا بشۆ...

خینژی (بلی) دێدێ یاپیر یێ ماین گژک* دلێ وی دکەتن، شاگرتێ دکانا توجار ژی هەرتم (هەمیشە) قەرفی خوە (ترانێ خوە) وی دکرن، ژێ را دگۆتن گیکی" پۆزێ وی (دفنا وی) دکشاندن، ناڤا چەعڤادا ددانی، کومێ وی دکرنە سەر چەعڤا .

لێ چارڤان تەماما دبوو.

هەرچار وێ یەکێ نەدبوو، وەکی ئەوی نکار بوو بەر برچیبوونێ تەیاخ( دەوام ) کرا. مالێ دا وەختێ برچی دبوو،دچوو نان ژ ئشکەفێ* هلتانی، پەنیر ژ کووپ دەردخست و دخارو دچوو خوەرا دلیست یانێ ژی دکرە پێشا خوە و دچوو چۆلێ. چ وەختا دلێ وی دخوەست بن دارەکیدا یانێ سەر کانیکی روودنیشت و دخار.

نها ڤێ دەرێ جورەکی ماین بوو.چاڤ ژی برچی بوویا، گۆتی بەرخوەبدا، حەتانی وەختی خوارنێ دهات ،ئەو ژی گەرەکی بخوەرانا،پاشێ ئەوی بخوەرا . ئەو بێ خوویێ وەعدە ژی ئوسا دەرەنگ دهات وەکی برچیبوونا ئەو ددەلییا (نێز دبوو).

پاشێ سەبر کرنا جارەکی دودا، دەها ،ئەوی ئاسپێژخانێ دا چەعڤێ خوە هەرچار ئالیەا گەڕاند، جکا قە تشتەکی خارنێ تونە، بخوە وەکی دلێ وی ناڤا نەچە (دلێ وی نەخەرقە) حەتانی وەختێ خارنێ تێ .

پێشییێ چ ددیتەهوورکێ نانێ حشک، هەستییێ کۆتی* (کۆرتی)،یانێ ژی تشتەکی ماین دکرە دەڤێ خوە.

خێلەکێ شووندا فکری(پاشی بهۆرینا دەمەکی کێم فکرکر) وەکی ئشکافێ ئاسپێژخانێ بنهێرە. پاشێ خوە راکرە خەیسەت، چیتێ گوشتێ نیڤکەل ژ بەرۆشا خارنێ دەرینە.

لێ وەکی بدیتانا!...

وێ چ تشتەکی خراب بقەومیا.

وەکی بدیتانا!...

لێ چ بکی ؟

بهێلی و برەڤی ؟...

گیکۆر دەست پێ کر دەرهەڤا (ل بارا) رەڤێ دا فکری .

لێ چاوا برەڤی ؟ کی ئالی برەڤی؟ تەنێ رێ و دڕبانزانی*، مەری یا ناس ناکی ....لێ باڤ ....

ئەو ڤاس چرچری، خەبەردا، شیرەت کرۆژن لاوۆ،وێ بێن و دەرباز بن...وێ دەرباز بن!...."

زەنگلێ خستن

گیکۆر ژ جی قولۆز(بلند) بوو. ژێ را گۆتبوون،وەکی وەختا زەنگلێ دخن ، هەرە بنهێرە کییە.چ دخازە. ئەو دەرکەتە دەرڤا، ژ رەواقێ (ئەیوانێ) بەر ژێر نهێری. دیت وەکی ماقوولەک وچەند خانم بەردێری سەکنینە.

ژۆردا کرە گازی :

" هوون کینە؟ ئێ! "

ژ ژێری ژۆری نهێرین (میزە کرن) خانم کەنیان لێ ماقوول بەر چەعڤکا خوە

راست کر وپرسی :
" خانم مالە؟"
گیکۆر پرسی :
" چ شوخولی وە پێ هەیە."
ژێری شەڕ دهاگوڕ بوو.
ماقوول هێرس کەت ( توورە، بوو ) :
" ژ تە دپرسن مالە یانێ نا! "
ــ شوخولی وە لێ هەیە؟
سەرڤێ قالمە قالمێ خانم دەرکەتە دەرڤا :
ــ وەی تو چیتی چیتی بی ، هەی، دە زوو هەڕە دێری ڤەکە."
کرە قووژین ودەست پێکر نفری ل گیکۆر ومێرێ خوە کر. لێ زووترەکی مێڤان هاتنە کفشێ وئەو بەشەرەکە خوەش چوو پێشیا وانا.
ــ ئێ ، سەلام، هوون ل ڤر؟! ئەو چاوابوو وەکی وە ئەم بیر ئانین .
ماقوول سەری حەتانی لنگا ل گیکۆر نهێڕی وپرسی:
" وە ئەو ژ کیدەرێ ، دیتییە ؟"
لێ خانم ژێ هەلاهێ دکەنییان
ــ چ چەعڤنەباری یێ دکن ئەگەر هوون دخازن ئەم بدنەوە؟! خانمێ ب لاقردی گۆت ومێڤان ب کەن چوونە هوندوڕ.
ناتۆخانمێ گیکۆر جییادا شاند وپێرا، پێرا داپەیێ وان وهاتە هوندوڕ.
پاشی سلاڤ ، کلاڤا ،مێڤانا دەست پێکرن سەرهاتییا هاتنا خوەیە هوندوڕ شرۆڤە کرن وبوو سەرهاتیکە مەزن.
ــ ئۆف ، ئەوی مەرەزا من گیهاندییە... ناتۆ خانمێ گازنێ خوە دکر، وەکی هوون زانبن ئەو چ تینە سەرێ من ...ئەز دبێم ئەم دەرخن، برا بجەعنمە هەڕە، لێ هوون خەیسەتێ "ئارتێم" زانن، دبێ گونەیە، زاڕا، گوندە،برا بمینە، پارییێ نانە،وێ بخوە،وێ هین بە. ئاخرتاکەنگێ؟ ئەوی مەرەزا من گیهاند...
ــ خانمێ مێڤان ڤی ئالی وی ئالی دەست پێکرن گازنین :
ــ وەی،وەی، وەی ئیدایا وان خولاما نەبێژە.
وەکەنیڤ سەعەتێ ڤردا وێدا ژخولاما ژ تەزەتییێ شەهەر خەبەردان.هەماسەروێ خەبەردانێ گیکۆرێ خوودایی هاتە هوندوڕ:
"خانم من ئێمیش (مێوە) ئانی.
ــ ئەرێ ، دەپاک ، هەڕە. خانم سۆرۆمورۆ بوو، ئەمر کر. لێ مێڤان کەنییان .
ــ "خانم خەزین دگۆت فشنە بهانە نەلازمن..."
سەرڤان گلییا بوو پیرڤیناهنەکا و ب دەستمالا دەڤێ خوە گرتن ، لێ یێمایین ژێ بۆنا سوورەشی‑یا خانمێ بدەنە ڤەشارتنێ، گۆتن وەکی راستی ژێ فشنە زەعف بهانە،ڤێچاخی کی فشنا دکرە؟ پاشێ لێ هەلاتن وەکی ئێمیش چرانە، خوە بۆنا نان خارنێ نەهاتنە، چرا جەفێ دکشینن .
کەڤانییامالێ حەتانی پەلکا گوە سۆرۆمۆرۆ، ببوو،هەرتەهەری دخوەست ئەوێ سوورەشی یی بدە ڤەشارتنێ.
ــ کی زانە چ گۆتییە، ئەڤی ئەفسانەیی فەعم نەکرییە :
ــ کمی دەرەوا دکە عەردێ دا هەڕە."
گیکۆر سووند خارو حەموو تشت تەمام بوو.
ناتۆ خانمێ گاڤا مێڤان ڤەرێکرن ،ب هێرس بلند بلند خەبەر ددا وئیستۆ لا ئێمیش بەرەڤ دکر. ئەوێ گیکۆر ڕاددا چیرا، یەک یەک ددا رێزێ، وەکی ئەو چ دکە، نفرِی و ئافری ل بەختێ خوە،مێرێ خوە دکر.
دێدێ یاپیر دکرە ئاخین :
" ڤیزێ خامە، لاوۆ وی هین بە،لاوۆ تو چڕا بینا خوە تەنگ دکی.... ئاخ خودێ تو چرا روحێ من ناستینی ..."
ــ خوەزل "خوزی" من زانبوویا گاڤا هێرسا مەری یا رادبە،توچ خەبەر ددی ... وەکی خامە

دەهوون دەوسێ* بخەبتن، خو
ئەز نە خولامێ وەمسە ...
بووکێ دها دەنگێ خوە بلند
دکر،جابا (بەرسڤا )پیرێ ددا و
حەتانی هاتنا مێر گازن و
نفرِی دکرن .

گاڤا دەنگێ لنگی مێرێ
خوە بهیست ،دەست پێکر
گرییا،دها بلند خەبەردا و
ودەردان لەڤ خستن.

ئەز دبێم دەرخە، برا
بجەعنەمە هەرِە:

ـ ئەزێ خولامەتیێ ژی
بکم،یانێ حەیفا تەپەراتێ
وەکی خولامەکی پاک بگری؟..
دها پاکە مەری یێ خولامە-
تییێ ژی بکە، نەکو هەرِو
ها هنا ڤی مەری یا
زەرکە... خوە تو نە دژمنی
منی ؟

توجار ئۆرتا مالێ سەکنی
و پرسی :

" چ قەومییە ؟"

ـ ئێدی وێ چبە، هەو
مابوو وەکی ئەم بەرخەلقێ
ژی عەردێ ساردا بچوونا
تە ئەوژی کر،ئێدی وێ چ
ببە."

خانم ژ جی قولۆز بوو
گلییێ فشنا ژێرا گۆت :

ـ توجار کرەگازی:

ـ" پەی ؟!"

ـ ئاخ خودێ،پێرا رەحم
کەسەر رادهشتن و ڤردا
وێدا دچوو و دهات .
توجار گازی گیکۆر کر.
گیکۆر ب تەرپە تەرپهاتە
هوندورِ.

توجار گازی کرێ:

ـ" ڤردا وەرە! "

گیکۆر ژ رەنگێ روویێ
وی ترسیا،جییێ خوەدا
سەکنی .

ـ ئەز تەرِا دبێژم
وەرە نێزیک ...

ڤێ جارێ گیکۆر ژ جی
لەقیا،لێ دیسا جییێ
خوەدا سەکنی....

ـ لۆ کوتکێ حرچا ئەز
تەرِا دبێژم،هەرِە خانمێرِا
بێژە،لێ تو تێی مێڤانارِا
دبێژی ؟! وەکی فشنە بهانە
ئەرێ ؟! ...

ـ من...من...خانمێ رِا ..

گیکۆر دخوەست خوە
عەفوو کرا، لێ گلی هەلا
(هێ)دێڤدا (ل دەڤی دا )توجار
شەماقەک دایێ، بەرچەعڤێ
وی پرێسک* پەکییان ،سەرێ
وی ل دیوارێ کێلەکێ
کەت وعەردێ کەت . توجار
عەردێ دا پێ پحینا (پێنا )
لێ ددا وهەی ژی پێرِا
دوەکلاند* فشنە بها بوون ،
ئەرێ...فشنە بها بوون
ئەرێ ؟!..."

دێدێ با پیر ب رجاف
(لەرزین) کەتە ئۆرتێ
(نیڤەکی)، دخوەست کورِێ
خوەیی هار بوویی پاشدا
کاشکە، خانم ژی هات .
زارا ژی کرە قاژە قاژ

توجار سەکنی ، بێن فشک
پێ کەتبوو، دوەکلاند
(دگۆت) :

" فشنە بها بوون ئەرێ؟"

چەعڤێ خوە کوتا بوو
گیکۆرێ کو قولچدا( کونج دا )
قنشلی بوو سەرهەڤەدلەرزی
و دکرە زارە زار:

ـ وەی دایێ جان،وەی
دایێ جان، وەی !...

بەرەوزمانی یەکگرتوو

سەید کەمال نزامی

ئەز پیرە کالەکم کو دەرد و ئێشید ژیانێ پشتا من خار کرییە، نەداری و فەقیریێ دەست وپی یێد من گرێ دایە، من ژیانا خو ب پالەتی و خولامەتی یێ بهۆراندییە هەر رۆژێ مالا من پشتا من بوو، ڤی گوندی دچۆمە وی گوندی. ئەمما دەردێ کو ژ حەموو دەردان گرانترە و ئاخینێ دئینە بەر دلێ من ئەڤەیە کو دێ بووە جەوان و خۆرتێد زەمان بێژم هیڤیدارم ببە هەگەرا عێبرەت وشیرەت، لێ ڤەگرتنا وە گەنج وخۆرتێد خۆشدڤی بەلی سەرهاتا ژینا من ڤهە دەست پێ دبە :

ئەز مرۆڤەکی فەقیر و نەدار بووم. من و خیزانا خو شەڤ و رۆژ بۆدەست ڤەئینانا کۆرەک نان خولامەتی وپالەتی دکر، پاشی چەند سالان خیزانا من پێگران بوو، ئەمما ل بەختێ رەش یا باشتر بێژم نەداری وفەقیری بوو هەگەرا ل دەست چوونا خیزانا من.

بەلێ رۆژا کو خیزانا من بچووک دبوو زۆر نەرحەت و نەخۆش بوو، م ل هەر دەرکی دا، بەلکە هندەک پارە قەر کەم، خیزانا خو بگەهینمە شار سەر دوختۆر و حەکیما. ئەمما بێ فایدە بوو چ کەسەکی دەستێ من نەگرت. ئاخرو عاقبەت خیزانا من ل ڤێ دونیایێ بۆ هەمێشە خاترێ خو خاستوئەز هێلام و گەل بچوزکەکی.

بهەر گۆل و دەردەکی من ئەو مەزن کر و دانانده بەر درس خاندنێ،شەڤ و رۆژ م زەحمەت دکێشا، ب پالەتی و خولامەتیێ من شیبا کۆرێ خو رێکەمە باژێر. تەواو خەباتا من ئەو بوو کو کۆرێ من دەرسێ بخوونە.

بۆڤێ هندێ کو کۆرێ من پێ فکرەکی ئازاد بێ گیروگرفت دەرسێ بخوونە. من چ ژن نەئینا هە ئەز بووم و ئەو.

ل ڤێ دونیایێ دا تنێ ئارزوویا من ئەوە بوو کو کۆرێ من دەرسێ بخوونە، بەلکە ل ئاخرییا عەمرێ خودا ئەز بشێم ئاسوودە روونمە خارێ نانەکی رحەت بخۆم، ئاخر وعاقبەت پاشی بهۆرینا چەند سالا کۆرێ من دەرسا خو خلاس کر، چوو شارەوانیێدا خەریک بوو و دەرجا ئەفسەرییێ ڤەرگرت. ئەز زۆر کەیخۆش بووم کو زەحمەت و ئەزیەتا من ب خۆرایی نەچوو، ئەمما م نەزانی کو بەدبەختی یا ژیانا من تازە دەست پێ دبە.

پاشی هنگێ کو کۆرێ من چوو شارەبانییێ، ئێدی ئەز ل بیرا خۆ برم و های ژ م نەبوو، هەشت و نەه سالەک بهۆرین ،ئەز زۆر پیر ببووم ئێدی من تاقەتا شۆل کرنێ نەمابوو، چ کەسەکی ئەز بۆ پالەتیێ قەبوول نەدکرم ،نەخۆش و ماندی کەتبوومە بەر دیواران تنێ ئومید و هیڤی یا من کۆرێ من بوو، رابووم دوورا هاتم باژێر، بهەر جورێ هەیی م نیشانییا شارەبانیێ پەیدا کر هاتم بەر دەرێ شارەبانیێ مەئموورەکی جاحێل بەر دەری راوەستابوو قەستا من

کر و هندەک پارە دەرێخست کو بدەتە
من ، م گۆت :
- ئەز پارسەک نینم م شۆل فلان
کەسێ هەیە .
گۆت : تە چ شۆل پێ هەیە .
م گۆتێدا : ئەز بابێ وی مە ،ئەوی باور
نەکر، فکر دکر م هش وهەدامێد خو ل
دەست دایە.
گۆت : بەس لێرە راوەستە دێبچم بێژ-
مێدا .
پاش چەند دەقیقا هات و گۆت :
- خالۆ من گۆتە تە، تە خەبەرێ
من نەکر، بخو گۆت م باب چنینە بابێ
من مێژڤە مرییە .
باوریبا من پێ نەهات ،تەواوبەدەنێ
من بوو ئاڤ . من دەستدا گۆپالێ خو
بزۆرێ قەستا حەوشا شارەبانێ کر، هندی
مەئموورا کر، نەشیانپێشی یا من بگرن
چاڤێد من زەربانەدا طاری بوون ،یەکمین
ئۆدا کو ئەز گەهشتمێدا من دەرێ وێ
ڤەکر • کۆرێ من ل پشت مێز روونشت
بوو سەرێ خو بلند نەکر، م ل هەوارا
دا، چوومە پێش،بێی وێ هندێ کو سەرێ
خو بلند کە کرە گازی مەئموورا ئەڤی
خازۆکی فرەدەنە دەرێ.
ئەز جهێ خودا حشک بووم . چەند
موئمووورا دەستێ من گرتن ، بزۆری ئەز
ل ئۆدێ دەرێخستم، هەلا هەلایا مەئموورا
ئەیوانا شارەبانیێ تژی کر بوو.
نشکێدا دەنگێ مرۆڤەکی ل دوورڤە هات
گۆت :
- بەردەن .
کرە گازی من ، خالۆ کا وەرە ئێرە .
ئەز برمە ئۆدا خو ،گۆتە من خالۆ
تە چ شۆل هەیە و تە چ لازمە .
من گۆتێدا :
- ئەز نەهاتمە چ، ئەز هاتبووم کو
کۆرێ خو ببینم ئەوژی وەکوو دیارە کۆرێ
من لێرە نینە .
بهەر جورێ هەیی من حال و قسەتا
خوو کۆرێ خو ژ سەریدا بۆ وی گۆت .
سجلا من ل م وەرگرت و پاش چەند
دەقیقا کرە گازی کۆرێ من :
- کا وەرە ئەوە کی یە؟
کۆرێ من هێشتا نەهاتبوو ژۆردا ،دوورڤە
گۆت :
- جەناب سەرهەنگ ئیرۆکە ئاوروویا
چەند سالەیە من لال، دۆست و هەوکارا
چۆ، ئەز کیدەرێ ،ئەو پارسەکە کیدەرێ
سەرهەنگ سجلا من فرەدا لال، وی و
گۆتێدا :

- زوو پێش چاڤێ من دەرکەڤە دەرێ،
تە سەلاحییەتا وان جلکا چنینە زوو ،
تەحویل بدە دەرکەڤە .
مێژوویا ژینا پر دەرد وئێشە من
وەکی پەردا سینەمایێ ل بەر چاڤێ من
بهۆری، ئەو سالێد کو من ب کول و
دەرد ئەڤ کۆرە خودان دکر هاتە بیرا
من و من ئەو دەم دگەل ڤێ گاڤێ،دا-
بەرێیک، گەلۆ دەستڤەهاتا چەندین سال
زەحمەت و دەردەسەرێ هەر ئەڤە بوو کو
من دیت؟!

ئەم وتارە وەرگێراوی شیعری مەرگی گورگی ئالفرددۆینی یە کەشاعیرێکی بەناوبا- نگی رێبازی رۆمانتیکی فەرانسەیە ( ١٧٩٧ تا ١٨٦٣ میلادی) **سروە**

# مەرگی گورگ

عەزیز کەیخوسرەوی لەفارسی یەوە کردوویە بە کوردی .

هەوره گەواڵ گەواڵەکان وەک دووکەڵی کە لە ئاگرێکی گلپە*سەندوو راپەڕێ ودەرباز بێ، بەلە*ز لەرووی تریفەی خەرمانی مانگ تێپەر دەبوون،چرستانەکان تا داوێنی ئاسۆ وێکرا نوقمی تاریکی وئەنگووستە چاوی بوون .

ئێمە هەموو لەنێوکوێرە رێگای نێو چیمەن وبژوێنی شەداردا شەقاومان دەهاویشت کوت وپڕ لەژێر چەند دارێکی سنەوبەردا ، شوێن پێی گەورەی گورگە گەرۆکەکانمان دیتەوە کە لەمێژ بوو بە شوێنیدا وێڵ بووین . راوێستاین متەقمان لەخۆ بڕی . هەستیارانە گوێمان هەڵخست هیچ ورتەیەک لە دڵی پێدەشت ولێڕەواردا هەست پێ نەدەکرا ، جگە لە جریوەی باڵندەیەکی دەمبە سکالای مەینەتبار کە لە ئاسماندا بوو دەنگێکی دیکە نەدەبیسترا ،
با بەرزەفڕانە شنەی دەهات پێی لەسەر کۆشکی تەریک وئەو داروبەردانەدا دادەنا کە لە قەراغی گاشەبەردەکاندا چەمیبوونەوە بەچەشنێ ئانیشکیان دادابوو دەتکوت خەو بردوونیەوە . گەرچی دنیا کپوکپ بوو، شارەزاترین راوچی لەکۆڕی ئێمەدا دانەوییەوە ولەسەر زیخەلانەکاندا پاڵ کەوت ئەو کە هەرگیز درۆی ، لەگەڵ نەکردبووین برێک دوای ئەو بە سرتە هەواڵی دا کە ئەوە شەقڵی شوێن پێی دووگورگ وبێچووەکانیەتی ئێمەش خێرا کێردەکانمان لە کێلان دەرێنا و چەکی راومان کە لوولەکانی دەدرەوشانەوە شاردەوە .لاسک وگەڵاکانمان وەلادا تا بە هەنگاوە ئەسپایی یەکانمان بڕۆینە پێشەوە. لە پڕدا سێ کەس لەئێمە لە جێی خۆیاندا قیت بوونەوە، من برێ چوومە پێشەوە تا بزانم چییان دیتوە، سەرنجم بە دوو چاو کەوت کە لەو شەوەزەنگەدا تروسکەیان دەهات . کەمێ دوور لەوان چوار قەڵاقەت لە تریفەی مانگدا لەناو بژوێنەکان هەڵدەبەزینەوە و شێوەی ئەو سەگانەیان دەدا کە هەموو رۆژێ لە دوای گەڕانەوەی خاوەنەکانیان کەیف خۆش دەبن و بە قروسکەقروسک دەکەوتنەهەڵبەز ودابەزەوە، شێوی هەرچواریان وسەماکانیشیان وێک دەچوون بەڵام بێچووە گورگەکان لەکاتی کایەدا بێدەنگ بوون، لەبەرەوەی دەیانزانی کە دوو هەنگاو لەولایانەوە دوژمن یانی بەرەی ئادەمیزاد لەچوارچێوەی خانووچکەکەیا- ندا وفێڵبازانە بۆسەیان بۆ دەنێتەوە .

گوڵە گورگ لەسەر پێ راوەستابوو. برێ دوورتر لەشان دارێکدا دێڵەگورگ وەک پەیکەری ئەو گورگەی کە رۆمیانی کۆن دەیان پەرست و رێمووس و

رۆمۆلووس لەمەمکەکانی ئەو شیریان دەخوارد چوبووەخەو و گوڵەکە هاتە پێش و چنگی تیژی لە زیخەکە دا نوقم کرد وهەڵتوتکا.چون تێگەیشتبوو کە رێگەی دەربازبوونی بۆنەماوەتەوە و لەهەموو لایەکەوە لە گەمارۆدایە وئیتر رێگای دەربازبوون لەمەرگی نەماوە کاتی مەرگی بەچاوی خۆی هەست پێکرد لەجێی خۆی هەستاو بە تووڕەیی یەکی زۆرەوە کەڵپەی زاری ئاگرینی لەقوڕگی دڕترین سەگی راوی ئێمە گیر کرد، ئەگەر چی گوللەکان پەیتا پەیتا گۆشت وپێستی لێکتر یەکا*لاوە کردن وکێردەکانی ئێمە بەردەوام لە دوو کەلەکەی رۆدەچوون ولەنێو لەشیدا یەکا*نگر دەبوون.ئەوەندە بە کەڵپە ئاسنینەکانی قوڕگی تاژی گوشی ئاخری لەبەر پێی دا گلۆ*ر بۆوە. ئەو کاتە گورگ دەستی لێ هەڵگرت وبە وردی سەرنجی ئێمەی دا. کێردەکانی ئێمە تا مشتوولە هەردوو کەلە- کەی ئەو بەئاشکرا جێگیر ببوون.

لەنێو چیمەنە بەخوێن سووربووەکەی خۆیدا بە یەکجاری لە جووڵەیان خست تفەنگەکانی ئێمە بەشێوەی نیمچەکەوانێک جەستەی داماویان ئابلۆ*قەدا. گورگ جارێکی دیکەش بە ئێمەی دا روانی یەوە، پاشان لەسەر زەوی بۆی درێژ بوو. سەرقاڵی لستنەوەی ئەو خوێنە بوو کە ئەملاو ئەو لای زاری داپۆشیبوو. بەبێ ئەوەی زەحمەتی بیرلەمردن کردنەوە بدا بەخۆی، چاوە زبرەکانی لێک نابێ ئەوەی بچووکترین هاوار بکا گیانی سپارد.

نێوچاوانم خستەسەر چەکە بێ ساچمەکەم وچوومە ناو بیروخەیاڵاتەوە،لەبەر ئەوەی نەمدەتوانی خۆم بەگرتنی پێ شوێنیدێڵەکەوبێچووەکانی رازی کەم.کە هەرسێکیان لە چاوەروانیدا مابوونەوە و ئامادەی هەڵاتن نەببوون تەنانەت دڵنیام کە دێڵە گورگی جوان وپەشێواوئەگەر لەبەر چاوەدێری بێچووەکانی نەبوایە جووتەکەی لەگێرەو کێشەی مەرگدا تەنیا نەدەهێشتەوە بەلام ئەرکی ئەو رزگارکردنی ئەو تووتکانە بوو تا رایان بێنی چۆن دەبێ جەزرەبە و برسیەتی بکێشن وهیچ کات لە دەوروبەری شارەکاندا کە بەرەی ئادەمیزاد لەگەڵ گیاندارانی ماڵیدا بڕیاری هاوکاریان بەستووە نەگرین

لەبەرخۆمەوە گوتم بەداخەوە هەرچەند ناوی پڕشکۆی مرۆم لەسەرە چەندە لەخۆم وهاوچەشنەکانم کە هەموویان وەک من کەمتوانا وبوودەڵەن بەخۆدا دەشکێمەوە گوتم ئەی گیاندارانی ئازا هەر ئێوەن دەزانن کەچۆن لەگەڵ ژیان وکوێرەوەری یە- کانی ئەودا پیاوانە ماڵاوایی بکەن.

ئەگەر بیربکەینەوە کە لەسەر رووی زەویدا چی بووین وچی لەپاش خۆمان بەجێ دێڵین باش تێدەگەین کەتەنیا کپی ومەنگی شکۆدارە و هەرشتێ جگە لەونیشانەی بێ هێزی یە. ئاخ! ئەی رێبواری کێوی من شێوەی بیرکردنەوەی تۆم چاک لێکداوەتەوە.لەبەرەوەی دوایین سەرنجی تۆ لەناخی دڵمدا کاری کرد. سەرنجی تۆ دەیگوت "ئەگەر دەتوانی کارێ بکە کە گیانی تۆ بەهەوڵ وتەقەلا وبیرکردنەوە بگاتە ئەمرادەی خۆبایی بوون و بوێری یەکە لە سەرەتای لەدایک بوونم دا لە چرستانەکان خوووخدەم پێگرتووە. نالاندن، فرمێسک وەراندن وپاڕانەوە هەمووی پیشەی کلۆڵان وپەککەوتوانە ئەگەر پیاوی ئەرکی گرانی ژیان وەئەستۆ بگرە و لەو رێگایەدا کە چارەنووس بۆ تۆی دیاری کردووە بیگەیەنە دوایی وەک من کوێرەوەری بکێشە وبمرە بەبێ سکالا کردن.

پیاوێکی بەردتاش لەدێیەکی دوورەدەست دەژیا . هەموورۆژێ دەچوو لەکێو بەردی دەشکاند وبۆتاشین دەی هێناوە ماڵێ، شتی جوان جوانی بۆفرۆشتن لێ ساز دەکرد هەرچەند کارەکەی زەحمەت بوو ئارەقەیەکی زۆری لەسەردەڕشت پووڵەکەی کەمبوو بەڵامکارەکەی بەکەیفێ بوو.

رۆژێک لەرۆژان زۆرماندوو بوو هەناسەیەکی هەڵکیشا وگوتی:

خۆزگەمنیش دەوڵەمەند بوامو کەژاوەیەکی بەردەسوورم بایە لەسەری رادەکشام وتەماشای دەرەوەم دەکرد. لەوکاتەدا فرشتەیەک لە ئاسمان هاتە خوار گوتی:

ـ ئاواتەکەت وەدی هات .

بەردتاش تاچاوی کردەوە لەنێو کەژاوێکی جواندا کەپەردەی سووری جوان بەپەنجەرەکانیوە بووراکشابوو لەناکاوهەراهەرایەکی بیست . پادشا لە رێگا دەڕۆیشت پادشا سواری کالیسکە ببوو تاجێکی لەسەبوو چەترێکی زێڕینی بەرز کەسەرێ پادشای لەگەرما ، دەپاراست . سوارەیەکی زۆری لەگەڵ بوو کەلەپاش وپێشی دەڕۆیشتن بەردتاش کەپادشای بەورێزوحورمەتەوە دی دیسان هەناسەی هەڵکیشا و گوتی:

ـ خۆزگە پادشابام .

فرشتە گوتی: ئاواتەکەت وەدی هات بەردتاش بوو بەپادشا خۆی لەنێو کالیسکەدا دی کەچەند ئەسب سوار لە دەوروپشتی دەروێشتن تاجێکی جوانی لەسەربوو وچەترێکی زێڕین سەری لەگەرمایی هەتاوی دەپاراست . هەوا یەکجار زۆرگەرمبووراست بوو کەپادشا لەگەرما تووڕە نەدەبوو بەڵامچیمەن و گوڵ وگوڵزار لەتینی گەرما ، دەسووتان ،پادشاچۆن خۆری لەخۆی بەهێز تردی ،زۆرناڕاحەت بوو ،ئێرەیی پێ دەبرد. دیسان بەحەسرەتەوە

هەناسەیەکی هەڵکێشا گوتی:
- خۆزگە من خۆر بوامە.
فرشتە لەئاسمان هاتەخوارگوتی:
- خۆربە.
پادشا ئەم ئاواتەشی وەدی هات بووبەخۆروکەبەخۆی داڕوانی لەسەروبن وراست وچەپ، لەچوار دەوری رووناکی دەباری، بەچەشنێک کەتینی

سێلاومەڕوما ڵاتێکی زۆری ڕفاند. بەڵام تەنیا تاقەبەردێک لەپێش لاوی بەهورژم خۆی راگرت بەهیچ چەشنێک نەجووڵاوە.
هەرکەئەم بەردی دی توڕەبوو گوتی:
- بۆهێزی ئەوبەردەلەمن زیاترە؟
دیسان تێکچوو هاواری کرد ،ئەمبەردە لەمن بەهێزترە، دمەوێ ببمەئەوبەردە

گەرمی گیاوگوڵ وپادشاکانی دیکەی وەتەنگ هێنابوو لەناکاو پەڵەهەورێک کەوتە نێوان ئەرزوروژ وپێشی خۆری گرت، تینی گەرمی لەبەر هەورەکە نەدەگەیشتەئەرز. توڕەبوو هاواریکرد چۆن دەبێ هەورلەمن بەهێزتربێ وپێش بەتینی من بگرێ؟ ئەوجاریش نارازی بووهەناسێکی هەڵکیشاوگوتی:
- خۆزگەهەوربام.
فرشتەگوێی لێ بوو لەئاسمانەوە هاتەخوارو گوتی: باشە دەت کەم بەهەور.
خۆربووبەهەور ونێوان هەتاوئەرزدا راوەستا نەیهێشت گەرماوەگوڵ وگیاکەوی چیمەن وگوڵەکان سەوز بوونەوە ،هەور- یش بووبەباران وبەسەر ئەرزدا باری

فرشتەهاتەخوارگوتی:
- ئەوە ئەوئاواتەشت وەدیهات.
هەوربووبەبەردێکی گەورە کە نەبانەبۆران نەباران کاریان لێ نەدەکرد، تەنانەت لافاوی بەهورژمیش نەیدەتوانی کاری لێ بکا، لەناکاو تەماشای کرد پیاوێکی فەقیری پاچ وبێڵ بەدەست بۆلای ئەوەی کەچەند لەتی لێ بۆوە توڕەبووگوتی:
ئەوەکێیەکەلەمن بەهێزترە؟
دیسان هەناسەیکیهەڵکێشاوگوتی:
- خۆزگەئەوپیاوەبام.
فرشتە لەئاسمان هاتەخوارگوتی:
- ئاواتەکەت ودی هات
کابرابووە بەبەرتاشی جاران و زۆریشی کارپێ خۆش بوو.

# رێوی فێڵەزان

ڕەحمان چوبەگزەن

ڕێوی یـــەکـی فـێڵـــەزا ن دەگەڕا هەتا ئا وا ڵێکی گێـژو حۆل پەیدا کا کەکا ری پێ بکا و وبەرهەمەکەی بۆخۆی بخوا بەو خەیا ڵە وەڕێ کـــەوت هـەتـــا گەیشتە کیسەڵێک کـــدلـــەبـن پنجە گرا ڵکێک بـــەکـزومـا تـی دا نیشتبوو . ڕێوی سڵاوی لێکرد وپا ش چا ک وخۆشی گوتی:

"ما مکیســـەڵ بـــۆنـــا یــەی پێکەوە کا رێک بکەین هـەتـــا بژیوی زستـــا نـی خـــۆمـــا ن دا خـــەیـــن؟ . . .

کـــیـــســـەڵ گوتـــی:

"بـرا لـە ئەمن زۆرمپێ خۆشە وئا ما دەم بەو شەرتەی فێـــڵـــم لـێ نەکەی."

ڕێوی گوتـی:

"زۆرباشە .جا چۆن ئـــەمـن فێڵ لـەتۆدەکەم؟ وەرەپێکـــەوە خەریک بین مەزا ریەک بەگـــەنم دا چێنـیـن."

کیسەڵ وریێوی پێکـــهـا تـــن ومەزرا یەکیا ن پەیـــدا کـــردو بنەتۆویا ن خڕکردەوە . ڕێـــو ی ڕووی لـەکیسەڵ کردوگوتـی:

"ما مکیسەڵ ئەتۆ زەوی یەـ کەی بکێڵە ، ئەمن لـەمـــا ڵـــوو کردنی زۆرباش دەزا نم ."

کیسەڵ زەوی کێڵا وئـــا مـــا دەی کردوبەما مڕێـــوی گـــوت کـــە . ما ڵووی کا . ڕێوی گوتـی:

"ما مکیسەڵ جـا ئـــەتـــــــۆ ما ڵووی کە .تۆوچێنی وەک منت وەدەست نا کەوێ؟"

کیسەڵ زەوی ما ڵووکردوگوتـی:

"ما مکیسەڵ ئەتۆتۆوەکـــەی بچێنە بۆئا و دا شتنەکەی چـا و لـەمن کەبزا نە چی پێ دەکەم."

کیسەڵ تووەکەشی چا ند وریێـــو ی گـــوتـــی:

"ما مکیسەڵ ئا ویشی بدە جا دەبینی ئەمن چ پا ڵەیەکم .هەر بۆخوم دەیدرووەمەوە."

کیسەڵ ئا ویشی دا شـت .پـــا ش ما وەیەک وەختـــی درووونـــەوەی گەنمەکەیا ن ها ت .ڕێوی گوتـی:

"ما مکیسەڵ ئەتۆگەنمەکەی بدروەوە . ئەمنیـــش گـــێـــرەی دەکـــەم ."

کیسەڵ گەنمی درووەوە ،پاشان
ڕێوی گوتی:
"مامکیسەڵ ئەوجارگێرەیکە
ئەمنیش شەنی دەکەم وسووری
دەکەم ."
مامکیسەڵ گەنمی گێرەش کرد
ڕێوی پێشنیاری کرد

تەپۆڵکە ولەوێرا بەرەوخرمان
هەڵێین.ئەوی زووتر گەیشت
بەوی دیکەبڵێ"سووری من وکای
تۆ !" ئەوی زووتر بگاتێ
گەنمەکە بۆئەودەبێ."
کیسەڵ زۆری بیرکردەوە .دیتی
ڕەنج بەخەساربووە . گوتی:

ئەتۆش لەگەڵی بچوو بۆ سەر
تەپەپۆڵکەکە .ئەگەر ڕێوی بۆ
لای حزمان هات لەپێش ئەودا
هەڵدەستم ."
بەیانی زووڕێوی هەرفیکەی
سمێڵانی دەهات .بانگی
**کیسەڵی کرد ورۆیشتن بۆسەر**

"جا ئەتۆشەنی کە وبۆبەش
کردنی تەماشای من کە ."
کیسەڵ گەنمی سوورکردوکیلەی
حازرکردوگوتی:
"مامڕێوی وەرەبەشی کە"
ڕێوی گوتی:
"دەزانی چۆنی بەش دەکەم
دەبێ من وتۆ بچینە سەر هۆو

"ئەمڕۆ برێک ناسازم بۆ
بەیانی حازردەبم بۆهەڵاتن."
کیسەڵ بەغەمناکی رووی
کردە ماڵە دوستێکی قەدیمی
وشەو حاڵ ومەسەلەکەی بۆگێڕا
- وە .کیسەڵێ دۆستی گوتی:
"بەیانی ئەمن دەچم لەنێو
خرمان دا خۆم حاشار دەدەم،

**تەپۆڵکە . وێکرا دەستیان کرد**
بەهەڵاتن.کیسەڵ بەجێ ما
هێشتا ڕێوی چەند هەنگاوی
مابوو بگاتە سەرخرمان
کیسەڵەکەی سەری دەرێنا و
بانگی کرد "هۆ- سووری من و
کای تۆ !"
بەمجۆرە گەنمەکە بۆکیسەڵ
بوو ومامڕێوی فێڵبازیش کلکی
دەگەڵۆزی گرت ورۆیشت .

# سوورێژە

دە رۆژ پاش ئەوەی میکرۆبی سورێژە هاتە ناو جەستەوە ، نەخۆشی دەست پێدەکا ( جاروبارەش ٧ تا ١٢ رۆژ پاشان خۆی دەنوێنێ) سوورێژە لانی کەم چوار رۆژ پێش هەڵأزرانی* دەم و چاو ودەست وپەل وەگر (مسری) دەبێ.هۆی نەخۆشی سوورێژە جۆرێک ویرووسە . کەمواهەیە مروڤ دوو جار لە ژیانیدا سوورێژە بگرێ .

شکڵی ئاسایی ئەم نەخۆشیە بەم جۆرەیە کە منداڵ بۆماوەی چوار رۆژ نەخۆش دەکەوێ. لەم ماوەدا کۆخەی وشک دەکا و پلەی گەرمای لەشی دەچێتە سەر. جاری واهەیە پاش هاتنەخواری گەرمای بەدەن و هەڵأزرانی لەش نەخۆشی دووبارە سەرهەڵدەداتەوە.

چاو و کەپۆی نەخۆش ئاوی لێدێ و سەروسەکوتی دەماسێ. ئەم حالەتە زۆر وە "سەرمالێدراوی" ( **سرما** خوردگی) دەچێ.وردەزیپکە ـــ یەک بەناوی ( کوپلیک) لەسەر روومەت و لەنێو زاردا دەبیندرێ پاشان پشت گوێ و دەوروبەری زار هەڵدارژێن و زۆری پێ ناچێ تەواوی لەش دادەگرێ .

نیشانەکانی دیکەی ئەم نەخۆشی یە بریتین لە کزانەوەی گەروو، سوور هەڵگەرانی چاو، وێرای گڵ کردن* وئاولێ هاتن .

هەروەها لووەکانی ئەوک دەئاوسێن وگەرمایی بەدەن پاش ماوەیەک بەخێرایی کەم دەبێتەوە و لەم حالەدا منداڵ هەست بەچاک بوونەوە دەکا وپاش لەبەین چوونی هەڵأزران، پنۆک پنۆکی کاڵی قاوەیی بەدی دێن .

زیپکە **(** کوپلیک **)** تەنیا لە نەخۆشی سوورێژەدا دەبیندرێ و لە رۆژیکەوە تا سێ رۆژ پێش وەدیار کەوتنی پەڵەپەڵەی سوورێژە سەر هەڵدەدەن و زۆرتر لای پشتەوەی ژوورەوەی گۆنا دادەگرن. ئەم زیپکانە بەچاو وەک نووکە دەرزی دەچن ورەنگی لای سەروویان شینێکی سپی واشە و دەرەوەشیان سوور هەڵدەگەرێ.

لەگەرمەی نەخۆشی یەکەدا ( ئەگەر منداڵ چاوی بە رووناکایی بێتە ئیش) دەبێ لە ژوورێکی تاریکدا بکەوێ و شتی ئاوەکی زۆر دەرخوارد بدرێ .

سوورێژە، سەتلووجەم (سینەپهلو)، چڵک کردنی گوێ، زگەشۆرەو رشانەوەشی لەگەڵ دەبێ بەلأم ئانسفالیت (ئاوسانی مێشک ) زۆر کەم.

بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشی یە حەتمەن دەبێ بچنە لای دوکتۆر.

**شین بوونەوەی پێست**

شین بوونەوەی پێست زۆرتر لە لێووجەمسەرەکانی لەشدا خۆدەنوێنێ. وەک سەر پەنجەی دەست وپێ وبەڵگی گوێ.

پێست بە گشتی کەمێک شین دەنوێنێ. ئەمەش نیشانەی کەمبوونی ئۆکسیژێنی خوێنە. ئەم مەسەلەیەش یا لەبەر رەوەندی زەعیفی خوێنە یا لەبەر ئەوەیە کە منداڵ بەئانقەست چەند لەحزەیەک پێش هەناسەی خۆی دەگرێ و لەم حاڵەدا ئۆکسیژێنی بە "سی" و لە ئەنجامدا بە رەوەندی خوێن راناگا.

ئەگەر منداڵەکە ئارام بکرێتەوە، دێتەوە سەر حاڵی عادەتی. ئەگەر ئەم مەسەلەیە دیسان رووی دایەوە پرس بە دوکتۆر بکەن.

هەروەها لەوانەیە شین بوونەوەی هەمێشەی پشت لەبەر نەخۆشی دڵ بێ. جا لەم حاڵەدا جگە لە شین هەڵگەڕان قامکەکانی ئەستووریش دەبن. هەربۆیە پێویستە دوکتۆر دڵی معایەنە بکا.

**چڵکی گوێ**

چڵک کردنی گوێ هۆیەکی بەرچاوە، بۆ زیادبوونی گەرمایی بەدەن. ئێش پێگەیشتن یا ئەستوور بوونی پشت گوێ کاتێک کە بە ئەنگوست بیبزێوی، لەبەر زیپکەیەکە کە لەپشت گوێ یا لە کونە گوێ هاتووە. جاروبارە ئەو ئێشە لەبەر چڵک کردنی ئێسکی ماستۆئیدە ئەگەر دەبینن منداڵ زۆر کایە بەگوێی خۆی دەکا زوو "هۆ"یەکی بۆمەدوزنەوە

# چلکی گوێ
# خاوێن کردنی گوێ

شین بوونەوەی پێست
ئەستوور بوونی قامک

زۆربەی منداڵی بچووک عادەتیانە یاری بەگوێی خۆیان بکەن.

کە چاو لەگوێی منداڵ دەکەن لێی بپرسن بزانن گوێی دێشێ؟ ئەگەر کوتی دێشی بزانن ئاخۆ ئێشەکە لە کونە گوێدایە یا لە بەڵگی گوێدا. پاشان تەماشا بکەن بزانن گوێی ئەستوور بووە یان نا!

بەڵگی گوێی بەئەسپایی بۆلای پێشەوە داگرن، ئەگەر زیپکەی لە کونە گوێیدا هەبێ، ژان دەکا.

**خاوێن کردنەوەی گوێ**

ئەگەر شتێک چۆتە ناو کونەگوێ،هەول مەدەن خۆتان دەری هێننەوە،مەگەر سەرێکی شتەکە بەئاشکرا بەدەرەوە بێ. هەروەها قەت لە پەردەی گوێ(صماخ) مەکۆڵنەوە ئەم کارە پرمەترسی یە.

هەوڵ مەدەن شتێکی نووک تیژ، کە لۆکەتان لێ هاڵاندووە بەکونە گوێدا بکەن بۆئەوەی گوێ خاوێن بکەنەوە، مەگەر چڵکی گوێ (موم) لەدەرەوەی کونەگوێ یا لەسەرتای کونە گوێدا بێ. بەسەریەکەوەی شتی نووک تیژی وەک دەرزی و تەلەشقارتە* وشتی تر، بۆ گوێ خەتەرە و لەوانەیە

پەردەی گوێ ئەزیەت بدا .
بۆ خاوێن کردنەوەی گوێ هێندێک لۆکە با بدەن یا بە نووکی قوماشێکی نەرم ئەم کارە بکەن.ئەگەر لۆکە یا قوماشەکە نماوی بێ باشترە. ئەگەر چڵکی مومئاسای ناو گوێ، رەق ، بووبێ دەتوانن بە چەند دڵۆپ گلیسیرین یا رۆن زەیتوون نەرمی بکەنەوە بەڵام ئەگەر پێتان وایە گوێ چڵکی کردووە، ئەمکارە بێ پرسی دوکتۆر مەکەن.
لەبیرتان بێ هەڵازران بەهۆی سوورێژە لە پشت گوێ وە دەست پێدەکا وئەگەر گوێ چڵک بکا منداڵ لەبەر ئێشی ناو گوێی بێ قەراری دەکا بەڵام هەمێشە نا .
ئەگەر کونەگوێ خوێنی لێ بێ، زۆرتر لەبەر دەربوونی زیپکە ودوومەڵی ناو کونە گوێیە. واهەیە هۆی خوێن رێژی "شکان " بێ. بەڵام ئەوجۆرە خوێن رێژی یە وەختێک روو دەدا کە زەبرێکی گران لەسەری منداڵەکە درابێ لەم حاڵەدا خوێن رێژی ناوچاوی

منداڵەکەش دەگرێتەوەودەوری چاوی منداڵەکە شین دەبێتەوە وە وپنۆک پنۆکی سووریش لەناو چاودا دیاری دەدا .
ئەگەر کونەگوێ زنچکاوی لێ بێ، لەبەر ئەو ماددە موم ئاسایەیە کە لە ناو گوێدایە یا لەبەردەربوونی زیپکە ودوومەڵی ناو کونە گوێ یە .
ئەگەر مەسەلەکە ئێ بەڵگی گوێ وسەرتای کونە گوێ نەبێ، ئەوا حەتمەن دەبێ بچنە لای دوکتۆر.
شکڵی رواڵەتی گوێی منداڵی ئێوە چۆنە؟
ئاخۆ رێک و پێکە یا زەق و قوت وناشیرینە؟ بۆ ئەم مەسەلەیەش پرس بە دوکتۆر بکەن.
هیچ چەشنە موعایەنەیەک بۆ لووت رەچاو نەکراوە مەگەر ئەوەی کەبە لۆکە و پارچەی نەرم لەمنداڵی بەر مەمکان و وەرگێرکەدا* خاوێن بکرێتەوە.
ئەگەر دەتانەوێ کەپۆی مەلۆتکەیەک خاوێن کەنەوە هێندێک لۆکە دەئاوی گەرم هەڵکێشن ولوتی منداڵەکەی پێ خاوێن کەنەوە.
گیرانی لووت و هەناسە کێشانی منداڵ بە زاردا، هۆیەکەی زۆرتر سەرما لێدراوی یە بەڵام دەشتوانی بەهۆی چڵکنی سینووس و ئالرژی یەوە بێ. چڵم ئەگەر خوێنی لەگەڵ بێ یان رەنگی قاوەیی بێ هۆیەکەی زۆرتر " سەرما لێدراوی"یە .

# سروە
# خزمەتکاری فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی یە

# جەدوەل

تێبینی : لەپڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بەپێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە ڕەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی (ˇ) دانەنراوە واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی ( شڕ، کوڵ، زۆر، شەڕ و. ) ی تێدا بێ بە شکڵی ( شر، کول، زور، شهر و. ) دەنووسرێ .

| ١٥ | ١٤ | ١٣ | ١٢ | ١١ | ١٠ | ٩ | ٨ | ٧ | ٦ | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | ● | | ● | | | | | | | | | ١ |
| | | | | | | | | | ● | | ● | | | | ٢ |
| | ● | | | | | ● | | ● | | | | | | | ٣ |
| ● | | | | | | | | | ● | | | | | ● | ٤ |
| ● | | ● | | | | ● | | | | | ● | | | | ٥ |
| | | | ● | | | | ● | | ● | | | | | ● | ٦ |
| | ● | | | ● | | | | | | ● | | | | | ٧ |
| | | | | | | ● | | | | | | ● | ● | | ٨ |
| | | | ● | | | | ● | | | | | | | | ٩ |
| | | | | | | ● | | | ● | | | ● | | | ١٠ |
| ● | ● | | | | ● | | | ● | | | | | | | ١١ |
| | | ● | | | | | ● | | | ● | | | | | ١٢ |
| | | | | ● | | | | | | | | | | | ١٣ |
| | | | | | ● | | | | ● | | ● | | ● | ● | ١٤ |
| | | ● | | | | | | | | | | | | | ١٥ |

١ـ نازناوی مەولەوی تاوەگۆزی ئاژەڵی پێ تیمار دەکەن ٢ـ نیشانەی دەرد وژان ـ بەیتێکی فۆلکلۆری کوردی یە و لەبـاری تەوسیفەوە لە ریزەی شاکارە ئەدەبی یەکانی جیهانە ٣ـ چێژکەی میوەی تازە رەسیو ـ موزاریعی ئیلتزامی فیعلی بوون ٤ـ کابرای گۆرین ـ شارێکی بەناوبانگی کوردستانی تورکیا ٥ـ بازگەی سەر ئاو ـ حەسانەوە ـ دنە ٦ـ یەک لەوانەی دەگوترێتەوە ـ قەدیم دەیانپەرست ـ جوابی بەتاڵ وحەتاڵ ٧ـ نەخۆشی وەگر کە زوربەی خەڵک بیگرنەوە ولە مەڵبەندێکی دیاری کراو پەیدا بووبێ ـ کەوڵی بەقیمەتە بەڵام بۆخۆی زۆر بە زەرە ـ بە مانای ئەگەریش هاتووە ٨ـ دۆستی سوورا و ـ زەندەقی لە شاعیر چووبوو بەڵام گاڵتەی پێدەکرد ٩ـ زوڕنای شەڕ ـ هەم مردووە هەم زیندوو ـ ئاوی زار ١٠ـ هەگەر وبنۆس ـ گێژ و کاس ـ چاوی پێ دەڕێژن ـ یارمەتی ١١ـ پاڵەوانی ئاوسانەیی شانامە ـ دەفری و ئامانی ئێستاش ماوە ـ جۆرە ماشێنێکی ئەرتەشی یە بەڵام ئێستا وەرگەڕاوە ١٢ـ بەرر وقاقرەتی ـ بەزر ونادیار ـ ئەوەل فیعلی کورپەی ساوا ـ جومگە ١٣ـ هەرچی هەیە ونیە ـ رازاوە ورێک وپێک ١٤ـ دزێو ـ شارێکی کوردستانی عێراق ١٥ـ بەقەولی قەدیمیان خوشکی چلەی گەورە و چکۆلەیە وپاش مەرگی ئەوان شینیان بۆ دەگێڕی ولە حەیفان وڵات وەک جگ دەبەستێ ودەڵێ ئەوەندە بەفر دەبارێنم بزن لەسەر تەنیشتێ ئەستێرە بخوا. تیتۆڵ تیتۆڵ .

١ـ نیوچاوان گرژومرچ ـ دوامین شوینەواری لەچاپدراوی ماموستاهیمن ٢ـ باڵندەیەکی تەوەزەلە ونەقڵەکەی لە کتێبی فارسی منداڵاندا هاتووە ـ دەنگی مار ٣ـ کاری لەخوا ترس وموسڵمانە ـ بێدەنگی تەواو ٤ـ ئەویش هەر گێژ و کاسە ـ قەشەی دەغەڵی دەرباری تێزاری رووس ٥ـ لە میکرۆب چووکەترە بەڵام لەو بەکارترە ـ پەڕۆی لەت لەت کراو تێکەڵ بکزێ وای لێ بەسەر دێ ـ پیتێکی ئەلف وبێ ٦ـ بەیانان زیرە نیوەرۆیان زێوە بە شەو تەنەکەیە ـ شەموشەمال ٧ـ باسک وکەل و گەردەن، وڵاتێکی ئورووپایی یە وپێتەختەکەی کۆپنهاکە ـ شیعرێکی تەنیا وەزن وقافیەی هەبێ (هۆنە) ٨ـ سوورەیەکی قورئانی پیرۆز ـ دوو جار پیتێک ـ ئەستۆی پاش وپێش ـ مریشکی پێ دەردەکری ٩ـ ئی زۆربرسی بەنانی کەم ناشکێ ـ بەردێکی قورسی رەشی پتەوە ١٠ـ شۆرەتی شێخ شەهابی زانای بەناوبانگی کورد ـ نیوەی کۆمەڵ ١١ـ تێکوشان وحەول و خۆ ماندوو کردن ـ گۆشتی کێوی یەکەی لە کەوی یەکەی خۆشترە ـ گوند ١٢ـ سەڵت وسپادە زێدی مەلای گەورە ـ سەربازی هەل ومەرجی دژوار ١٣ـ دوور نیە ـ ئەربیلی کوردی ـ بەم شێوە ١٤ـ نیشانەیەکی جەمعی فارسی یە ـ زێدی رازی ـ نیشتمان ـ دەریایەکە ١٥ـ شاهیدی ڕێوی ـ دان خواردنی باڵندە ـ داری بەرزی بێ بەر .

**لەنێو ئەو کەسانەیدا کەپڕکراوەی ئەم ژمارەی سروەمان بۆبنێرن، یەک کەس بەپێی پشک بەبەرەندە دەناسرێ. بەمەرجێک ئەم خاڵانەی خواروو لەبەرچاو بگرێ:**

**١ـ جەدوەلەکە بەخەتێکی خۆش بنووسرێ وابێ پیتەکان بێنەخوێندنەوە.**

**٢ـ ئەسڵی جەدوەلەکەمان بۆبنێری لەکاغەزی دیکەدا بەشداری نادرێ.**

**٣ـ لانی زۆر پازدە رۆژ پاش دەرچوونی گۆوارپڕکراوەی جەدوەلەکەی ناردبێ.**

**٤ـ پڕکراوەی جەدوەلەکە هەڵەی تێدا نەبێ**

**جایزەی پڕکردنەوەی جەدوەل ساڵێک ئابوونمانی گۆواری سروەیە.**

# پەندی پێشینیان

کەرێ سرۆچنەیە ژێ وەرەنگ جاشکە .

کەر جارەکی دکەڤە حەری بێ.

کیێم بخۆ رەحەت رازێ.

قیزا کو دایک پەسنێ وێ بدە، بۆ خالۆ باشە .

روویێ پار سەکا رەش وتووری وان خوەشە .

کووپکێ ئاقێ، ئاقێ دا دشکێ .

ژن ومێرا شەڕ کرن بێ هشا باوەر کرن.

گەل کۆرا بخۆ،خودێ راچاڤ کە .

گورا راگۆشت دخۆ خویی راشینێ دکە.

جیهێ شێرا رووڤی لێ دکن گێرا .

ژدیوارێ خار، سەیێ هار ژنا فێلکار برەڤە.

پەزا تەک و تەنێ خارێ گورایە. .

* ئەو خورمایەی ئەتۆ دەیخۆی دەنکەکەی لەگیرفانی مندایە .
* میوان خۆشی لە میوان نەدەهات خاوەن ماڵ لە هەردووکیان .
* باری خوار ناگاتە مەنزڵ .
* شێر لەبێشە دەرچێت ،چ نێر بێ چ مێ .

برا بوو بە برازا کار لە کارێ ترازا .

بزن بۆ شەوێک جێی خۆی خۆش دەکا .

بەرد هەتا لەجێی خۆیەتی قورسە .

ئاوی سارد لەچێشتی کولێو مەکە .

مار بەقسەی خۆش لەکونێ دێتە دەر.

گورگ کە پیر بوو دەبێتە مەخسەرەی سەگی .

لەئاشی زۆری پێ چووە لە رێگایە پەلەی دەکا .

کەنگر و ماست بەوادەی خۆی .

## دیاری

## مەتەڵ

بەریدەی دەشتێکە
بیگری مشتێکە

" ؟ "

---

دوو ماری رەش
دوو چرای گەش
دوو کونە رێوی
حەوزێکی پان

" ؟ "

---

رەشی سەربەکڵاوە
کاری کوتانە وتێماوە
لەدەستان خۆشەوداماوە

" ؟ "

---

لە دەشتێ سەوزە
لە بازار رەشە
لەماڵێ سوورە

" ؟ "

---

ئەسپە رەشەی چل قەمتەر
هەر قەمتەرەی یەک نۆکەر

" ؟ "

---

دیاری ئەم ئازیزانەشمان پێگەیشتووە .سپاسیان دەکەین خوا یاربی بەنۆرە کەلکیان لێوەردەگرین .
بەم هیوایە ئەم خۆشەویستانە لەبیرمان نەکەن ودیاری جوانترمان بۆبەرێ بکەن .
کاک عومەر شێخ محەممەدی ـ دژوار چۆمانی ـ محەممەد واوی ـ محەممەدرەسوول بلندگرامی ـ محەممەد سالح مرادی ـ عەبدوڵڵا میهەنپوور ـ کلسووم یاهو ـ عوسمان خدرپەنا ـ خدر بارامبەگی ـ سمایل خۆشمەنیش ـ کەمال م ـ موزەففەر جەلیلیان ـ حەسەن ئەمینی ـ مەحموود سۆفی میرزا ـ زینەب پردئایادی ـ خالید رەسوولی رەزا رەحمەتی ـ عەبدولقادر شێخەپوور .

دوو درۆزن دەگـەنـە
یەک ،ئەوەڵی بە دووەمـی
دەڵێ :
– بابم مەنجەڵێکـی
دروست کردووە کەهەشت گەز
قووڵە و٢٠ گەز پانـە .
وەستا بەنەردیوان دەچوونە
ژووری ئەو مەنجەڵە و بە
دوو ساڵ دروستیان کرد."
درۆزنەکەی دیکە کوتی :
– جێت خاڵی بابـم
رۆژی هەینی رابردوو شەش
هەزار کەسی میوان کردبوو
سفرەیان کە راخست کـەس
ئەو سەرەوسەری نەدەدی ."
درۆزنی یەکەم کوتی :
– ئەو هەموو چێشتەو
دەچی دا لێنابوو ؟"
درۆزنی دووهەم جوابی داوە
– دەمەنجەڵەکەی بابت
دا !"

رۆژێک پیاوێکی هـەژار
هیچ پوولی پێ نابێ.بەلای
کەبابخانەیەک دا دەڕوا .
کەبابچی دەڵێ فەرموو نەهار
حازرە. ئەویش خۆی بـە
ژووری دا دەکا ودەڵێ :
" پێنج کەبابم بـۆ
بێنن"
کەبابەکان دەخـوا و
هەڵدەستێ بڕوا. کەبابچـی
دەڵێ :
" ئەدی کاکە پوولەکـەم
نادەیتێ ؟"
کابرای هەژار دەڵێ بـە
خودای یەک فلووسم نیە.
کەبابچی بانگی شاگـردان
دەکا وهەتا دەتوانن لێـی
دەدەن وکابرا دەڕوا .
رۆژی دوایی کـابـرا
دەچێتەوە هەمان کەبابخانە
و بەکەبابچی دەڵێ :
" هاتووم نان بخـۆم
بەنرخی دوێنێ !"

" ئەی ماڵەبابم ئەوە
نەخۆشی وا رەنگت پەڕیوە.
ئەوە کێ لێی داوی ؟"
کوتم :
"نەنە گیان کەس لێـی
نەداوم و زۆریش ساغ و
سلامەتم."
هات لە ئامێزی گرتم و
ماچی کردم و دەستی بـە
سەری داهێنام ولەپڕ هاواری
لێ بڵیند بوو:
" ئەیەڕۆ ئەوە نێـو
چاوانت بۆوا گەرمە.دەڵێـی
تەندوورە دایسێ."
بەو قسانە نـەخـۆش
کەوتم وسێ رۆژان دەجێ دا
بووم. باپیرم پاش سێ رۆژ
لە سەفەر هاتـــەوە و
خەبەریان دایە کە نەخۆشم
هاتە بن سەرمولێی پرسیم:
–" رۆڵەگیان ئەوەکوێت
دێشێ."
زۆر بە بێوازی چاوم هەڵێنا
و کوتم:
–" ئەمن نازانم کوێم
دێشێ لە نەنکم بپرسن !!

سۆل : پێڵاو ، کەوش
کوتک : کودک ، کوودەڵە
بەیانی: چۆڵەمە .هوف .وەحشـی
رەوەک .
کنج: جل ،جلک ،جل وبەرگ .
گژک : گشت ، هەموو .
کۆتن: کۆشتن ، کرۆشتن .
کوم: کلاو
ئشکەڤر: تەشتی تایبەتی نان
سوێنە .
رێ ودرب : رێگاوبان .
چەعف نەباری: چاونەباری ،
ئێرەیی . حەسوودی .
دەوس: شوون ، شوێن .
گلی: گازندە، گازن .
گلی: قسە گۆتن .
پریسک : پرووسک ،پڕیشک .
وەکلاندن: بلمەبلم، بۆڵـــە
بۆڵ .
تابوور :لەشکر .
دەڕێ: دەڕوا ،
کوور: قووڵ .
پێور ومێزین: نـــاوی دوو
ئەستێرەن(کۆو تەرازوو)
قۆچ: شاخ ،ئسترۆ، سرۆ .
ئارڤان: خواربار .
کێرگ : کەروێشک .
دەرگووش: منداڵی کۆرپە .

مەزەل: مەزار ،گۆر ،گڵکۆ .
خۆرت : گەنج ،لاو ، کوڕەلاو .
فایل: پەروەندە ، لەوح .
هێل : خەت .
مشەخۆر: زۆرخۆر ،مفتەخۆر .
پەیژە :نەردیوان، پەینجە .
تەپڵەک :تەڵبە ،ژێرسیغار .
ماچان: دەڵێن .
وەش : خۆش .
واتە: وتە، گوتە، قسە .
یایگە: هاتگە، هاتووە .
جە: ژ.لە (جەمن لەمن )
هاڕیاگ :هار دراو، ورد .
شیو: شام، خۆراک .
تێ هەڵبوونەوە: بەرەوژووەچوو
ــ نەوە .
کلێپەسەندوو :باش داگیرسـاو
گڕ گرتوو .
بەلەز: بە هەڕەمە .
یەکالاکردن: هەڵدڕین، لەبەر
یەک بردن .
یەکانگر: بەیەک گەیشتـوو ،
یەکگرتوو .
گلۆربوونەوە :خلۆربوونەوە .
ئابلۆقە :گەمارۆ، دەورەدان .
هەڵزران: سوور هەڵگەڕان و بــە
خوێن تێ چزان .
گل کردن: زیپکەکردن .
تەلەشقارتە :لەتکە شقارتە .
وەرگێرکە :منداڵی چووک .
پێ هەڵخستن:هەنگاو هەڵێنان.
لا کردنەوە : ئاوڕدانەوە .
لەپەسا: پەیتا ،پەیتا ،زوو .
باڵەتەپێ: لەنگان لەنگان .
ئاوقە :دەست بە یەخەبوون .
پڕواره: پرسیار .
پاچ کرن: ماچ کردن،ڕامووسین

سەکنین: ڕاوەستان .
هێسر :هێستر: رۆندک ،ئەسریـن
ئوندا: بەزر، وندا، ون
خوویا : دیار، ئاشکرا .
مێزەکرن: بــەرا خوە دان ،
نهێڕین ، تەماشا کردن .
قیچک : زەرێ وەکری،زەرد ی
ئاچغ .
قیز: کچ ،کیژ ، کەنیشک ،دۆت .
شخکەشخک : خشکە ،خشک ، خشە
خش ، گشتە گشت .
دێرە: فیستان،جلکی ژنانەی
کوردستانی ژووروو کە لـە
پارچەی رەنگاورەنگ وەک عەبا
دەیدروون .
بەدەو :جوان،جندی،زند ،خوشک .
خەبەردان: ئاخافتن، قســـە
کردن، پەیڤان، دوان .
جەم :نک ،کن،لا.با ،بال،لالێ
کال: پیر (بەتایبەت بۆپیاو)
هونداوڕ: ژوور .
زاڕ :منداڵ .
دەردان: قاپ ، ئامان .
کۆر: قوولکە .
حەزەنگ : کەسەر، هەناسە .
بێدەر: بێندەر ،جۆخین،خەرمان.
قۆچاخ :ژێهاتی،زیرەک ،کارامە .
مقات بوون: پاراستن، ئاگا
لێ بوون .
لۆد :دهی،لۆدە ، گیشە گیا .
خورت : دەسەڵاتدار ، بەهێز .
مەرتال: سپەر، مەتاڵ .
تاپی کردن: سەبت کردن ،
بەری:بەریک ،کوورک ،گیرفان
چەپل: چەنگ ، مشت .
قالچە :سمت وقالچە : نێک
تاخ: گەرەک ،مەحەلە .

سواری :
دیاری: سادق عیرفانی

کیژۆڵە
دیاری: گۆواری سروە

بۆمبارانی سەقز ۶۵/۱۰/۲۹
دیاری: عوسمان باژیان

تۆڕەوان
دیاری: خالید قەلعەکووهی

کێوی قرەقا
دیاری: هادی مەحموودی